بەرگی یەکەم

# فەرهەنگی مەردۆخ

کوردی، فارسی، عەرەبی





فرهنگ مردوخ

کردی
فارسی
عربی

نووسینی:
زانای بەناوبانگ و هەڵبەستوان
جەنابی ئایەتوڵڵا شێخ
موحەممەد مەردۆخی کوردستانی

لێکۆڵینەوە و ئامادە کردنی:
ڕەئووف ڕەهسوون

# فەرهەنگی مەردۆخ

«بەرگی یەکەم»

(ئـ ... ژ)


نووسینی:

زانای بەناوبانگ و هەرەبلیمەت

جەنابی ئایەتوڵڵا شێخ موحەممەد مەردۆخی کوردستانی

لێکۆڵینەوە و ئامادەکردنی:

رەئووف رەهنموون

**فەرهەنگی مەردۆخ**

**ویراست جدید**

**بەرگی یەکەم ( پیتی ئـ ... ژ )**

**نووسینی: موحەممەد مەردۆخی کوردستانی**

**لێکۆڵینەوە و ئامادەکردنی: ڕەئووف ڕەهنموون**

**ناوەندی بڵاوکردنەوە: خانەی بڵاوکردنەوەی پرتەوبەیان**

**ڕازاندنەوەی: سومەیە تەیمووری «سۆما»**

**جاری چاپ: یەکەم/ بەهاری ١٣٨٨ی هەتاوی**

**ئەژمار: ٢٠٠٠ دانە/ وەزیری**

**نرخی دەورەی دووبەرگی: ٢٢٠٠٠ تمەن**

| | |
|---|---|
| سرشناسه | : مردوخ، محمد، ۱۲۵۹-۱۳۵٤ |
| عنوان و پدیدآور | : فەرهەنگی مەردۆخ/ نووسینی مەردۆخی کوردستانی، موحەممەد. لێکۆڵینەوە و ئامادەکردنی ڕەئووف ڕەهنموون |
| مشخصات نشر | : سنندج: پرتوبیان، ۱۳۸۵. |
| مشخصات ظاهری | : ۲ ج. |
| شابک | : ج ۱ ۸ - ۳۰ - ۹۹۲۶ - ۹٦٤ - ۹۷۸ ؛ ٥ - ۳٦ - ۹۹۲٦ - ۹٦٤ - ۹۷۸ ؛ لدورها ۳ - ۷۹ - ۸۳۲۷ - ۹٦٤ |
| یادداشت | : فیپا |
| یادداشت | : چاپ قبلی: غریقی، ۱۳٦۲ |
| موضوع | : کردی - - واژەنامەها - - فارسی. |
| موضوع | : کردی - - واژەنامەها - - عربی. |
| شناسه افزوده | : رهنمون، رئوف، ۱۳٤۹-، محقق و ویراستار |
| ردەبندی کنگره | : ۱۳۸٥ ٤م ۲۳/ ۲۷٥٦ *PIR* |
| ردەبندی دیویی | : ک ۹/۰۳ ٤ |
| شماره کتابخانه ملی | : ۳۹٥ - ۸٥ م |

شابەک: ٨-٣٠-٩٩٢٦-٩٦٤-٩٧٨ ISBN: 964-9926-30-8



**خانەی بڵاوکردنەوەی پرتەوبەیان**

**« فەرهەنگ »**

١٤٨

**سنە - شەقامی شەهیدان، قەیسەری عیززەتی، نهۆمی دووەم**

**تەلەفون: ٢٢٥٨٧٥٩ ٨٧١ ٩٨ +**

www.kurdbook.com

# پێرستی پێشەکیەکان/ فهرست مقدمەها

هو

هر کس زوان خوی تواو نزانی　　زوان ترک و تات هرگیز نازانی

اگر گرکته هیچ دانه میٚنی　　فرهنگ مردوخ اشی بخوینی

* * *

هــو

هەر كەس زوان خـوەی تەواو نەزانێ　　زوان تـورك و تات هەرگیز نازانێ

ئەگەر گەرەكتە هیچ دانەمێنی　　فەرهـەنگ مـەردۆخ ئەشێ بخوێنی

مەردۆخ

## مقدمه‌ی ناشر (چاپ جدید)

یکی از اهداف و انگیزه‌های «انتشارات پرتو بیان» از بدو تأسیس آن در سال ۱۳۸۱، برداشتن گام‌هایی هر چند کوچک در جهت رشد، غنا و توسعه‌ی فرهنگ غنی و پرافتخار کردستان و احیاء فرهنگ مکتوب این دیار زرخیز در حد وسع، توان و امکانات محدود خود بود که به حق، هم آثار ارزشمند و ماندگار آن فراوان و هم نخبگان، فرزانگان و در یک کلام دانشمندان نامدار و گمنامش بی‌شمار...

اگرچه در این مدت کم با آمار قابل قبولی از کتاب‌های منتشر شده (قریب به ۱۷۰ عنوان در مدت ۴ سال) به زبان‌های کردی و فارسی و در زمینه‌های مختلف، گام‌های کوچکی برای رسیدن به هدف خود برداشته‌ایم، اما انتشار مجدد «فرهنگ مردوخ» خود به تنهایی کارنامه‌ای مستقل و افتخار ماندگاری برای خدمت‌گزاران این انتشارات می‌باشد.

آشنایان به فرهنگ و ادب این دیار می‌دانند که «فرهنگ مردوخ» یکی از فرهنگ‌های

دیرین، غنی، پربار و تنها فرهنگ سه زبانه‌ای است که توسط نادر زمان «آیت‌الله شیخ محمّد مردوخ کردستانی» به تنهایی، بدون دسترسی به کمترین امکانات و منابع امروزین در مدت زمان کوتاهی به رشته‌ی تحریر درآمده است. به گفته‌ی جناب آقای «عبدالمؤمن مردوخ» بار اول نسخه‌ی اصلی فرهنگ به انضمام نقاشی‌های رنگی‌اش به دلایلی نامعلوم در چاپخانه‌ی ارتش آن زمان مفقود گردیده؛ اما مؤلف توانا، دانشمند، نستوه و رنگین‌دست ما بار دیگر آن را از ابتدا با استفاده از یادداشت‌های قبلی و آنچه که در ذهن اقیانوسی‌اش بود در مدت کوتاهتری به رشته‌ی تحریر درآورده و حاصل آن چاپی است با دست‌خط مؤلف و رسم‌الخط کهنی که متأسفانه با وجود بی‌نظیر و منحصر به فرد بودنش، به دلایل فوق آنچنان که باید مورد استفاده‌ی اصحاب فرهنگ و اهل مطالعه قرار نگرفته است. بنابراین تجدید نشر آن با بازنویسی دوباره و رسم‌الخط نوشتاری جدید کاری بود لازم و در راستای اهداف این واحد فرهنگی؛ که االبته اضافه شدن واژه-های لهجه‌ی سورانی، زبان نوشتاری امروز کردزبانان، به کلمات مدخل لهجه‌ی اردلانی جلوه و رونق افزونتری به این اثر ارزشمند و گران‌بها داده است.

دو سال پیش وقتی پیشنهاد چاپ مجدد آن را به جناب آقای «عبدالمؤمن مردوخ» دادیم و با توصیه‌ی اضافه کردن معادل سورانی در کنار کلمات مدخل اردلانی به استقبال این کار آمدند؛ هیچگاه فکر نمی کردیم تکلیفی سنگین و راهی بس دشوار را در پیش گرفته باشیم که برای انجام آن توسط یک نفر، نه تنها ۶ ماه بلکه ۶ سال هم کافی نخواهد بود... در هر حال مسئولیتی بود که پذیرفته بودیم و آن هم نه از روی اکراه و اجبار، بلکه با میل، علاقه، شوق و رغبت... چراکه در همه جای دنیا برای عالمان سرزمینشان که چنین آثار گران‌بهایی را خلق می‌نمایند، چندین نفر و حتی چندین مؤسسه در خدمت حفظ، صیانت و انتقال آن به نسل‌های آینده هستند... ولی صد افسوس که در این گوشه از دنیا با آن‌چنان پیشینه و میراث گران‌بهایی، هنوز چنین رسمی رایج نشده است !!!

اولین قدم برای انجام این مسئولیت و کار سترگ پیدا کردن کسانی بود که در زبان‌های کردی، عربی و فارسی صاحب‌نظر و توانا باشند و این کار به‌راستی اگر نگوییم محال و غیرممکن که بسیار مشکل به نظر می‌رسید... هرچند که قصد و هدف ما دست بردن در متن و محتوای فرهنگ نبود و هیچگاه چنین اجازه‌ای به خود نداده و نمی‌دهیم؛ اما حتی برای

بازنویسی صحیح لغات دست‌نوشته هم، که بعضاً ناخوانا و تعدادی کم‌رنگ و مخدوش شده بود، نیازمند کسی بودیم با توانایی و مهارت‌های فوق. یکی از ایده‌ها برای رفع این مشکل تشکیل مجمعی متخصص از صاحب‌نظران در رشته‌های ادبیات فارسی، کُردی و عرب بود که متأسفانه نه چنین اتفاقی فراهم گشت و نه امکانات و توانایی‌های ما اجازه‌ی انجام آن را می‌داد و به قول معروف: «*دست ما کوتاه و خرما بر نخیل!*».

بالاخره پس از جستجو و پرس‌وجوی چندماهه با راهنمایی دلسوزانه‌ی استاد ارجمند جناب آقای «**علی رحمانی**» مدیر کتابفروشی امام محمد غزالی، جناب آقای «**دکتر رئوف رهنمون**» برای انجام این کار پیشنهاد شدند. از آنجا که آشنایی و اشراف پیشنهاد دهنده درخصوص محتوای اثر و وقوفشان نسبت به دشواری چنین کاری برای من کاملاً محرز بود، با اعتماد به نظر ایشان، انجام این کار دشوار بر عهده آقای «رهنمون» قرار گرفت. باید اعتراف کنم که در آغاز فکر نمی‌کردم و حتی انتظار نداشتم ایشان این‌چنین موشکافانه، دقیق و عالمانه زیر بار این مسئولیت رفته و فراتر از آنچه که ما و جناب آقای «مردوخ» از ایشان انتظار داشتیم، کمر همت بسته و از هیچ تلاش و کوششی برای حسن انجام کار فروگزار ننمایند. خوشبختانه ایشان علاوه بر پیشینه‌ی علمی و فرهنگی خانوادگی، با سوابق علمی و تحصیلی‌ای که در ایران و عراق فراهم نموده بودند؛ سرمایه‌ی مورد نیاز برای انجام این کار سترگ را به دست آورده بودند.

آنچه که ما انتظار داشتیم اصلاح و تغییر رسم‌الخط فرهنگ به شیوه‌ی نوین و نیز اضافه کردن معادل کردی سورانی برای هر مدخل اردلانی بود، ایشان ضمن دقّت کافی برای حفظ امانت، آن طور که شایسته و بایسته بود با دقّت تمام و موشکافانه، تمام جنبه‌های فنی کار را در نظر گرفت و چندین و چند بار متن ویراستاری شده را بازبینی، اصلاح و هر آنچه را که ممکن بود به اعتبار و سلیسی این طبع بیفزاید،گوشزد نموده و خود نیز رعایت نمودند.که جا دارد برای این حسن انتخاب در همین جا از ایشان و معرّف ارجمندشان تشکر و قدردانی نمایم.

قرارداد ما با ویراستار برای تحویل هر دو جلد ۶ ماه بود و اکنون که جلد اول آن را تحویل می‌گیریم نزدیک به ۲ سال از شروع قرارداد می‌گذرد. که البته تمدید آن با اطلاع و رضایت آقای «مردوخ» و برحسب نیاز و ضرورت بود. چرا که اثری چنین گران‌بها و

ارزشمند، شایسته نیست تنها به دلیل شوق و علاقه‌ی وافر به چاپ و انتشار مجدد، به شکلی سطحی و گذرا بازبینی شده و با خطاهایی که می‌شود از آن جلوگیری و پیش‌گیری نمود روانه‌ی بازار فرهنگ این دیار نمود. لذا تلخی این صبر ناخواسته را به جان خریده و خوشبختانه اکنون شاهد میوه‌ی شیرینی هستیم که به راستی مجموعه‌ی دست‌اندرکاران طبع آن سعی کرده‌اند آن را آن‌طور که فراخور و شایسته‌ی مقام علمی و فرهنگی چنین اثر و مؤلفی باشد تقدیم اصحاب فرهنگ این دیار نمایند، با اطمینان خاطر و افتخار می‌توانیم ادعا نماییم که تمام تلاش خود را برای رسیدن به چنین هدفی به‌کار بسته‌ایم تا که «*اصحاب هنر را چه قبول افتد و...*»

لازم است در پایان ضمن تشکّر مجدد از ویراستار محترم، از مؤسّسه‌ی «**فیان کامپیوتر**» که زحمت تایپ اولیه‌ی آن را برعهده داشته و نیز همکاران زحمتکش انتشارات خانم‌ها «**الهه کریمیان**» که غلط‌گیری، و «**سمیه تیموری**» که صفحه‌آرایی و آماده‌سازی اثر را برعهده داشتند و همچنین از سایر عزیزانی که هر یک به نحوی برای فراهم نمودن زمینه‌ی مقدمات چاپ این اثر ماندگار و گرانبها ما را یاری نمودند به ویژه « **جناب آقای آرتیکاس اقبال**» و « **جناب آقای نجم‌الدّین مقدّم**» کمال تشکّر و قدردانی را بنماییم.

امید آنکه مجموعه‌ی این تلاش‌ها مورد قبول و رضایت پروردگار متعال و نیز اصحاب فرهنگ و هنر و علاقمندان به فرهنگ غنی و پربار کُرد و کردستان قرار گرفته و با رهنمودهای خود، ما را در تکمیل و اصلاح چاپ‌های بعدی یاری رسانند.

**ناشر**

## پێشەکی بڵاوکەرەوە (چاپی نوێ)

یەکێك لە ئامانج و خولیاکانی بنیاتنانی **«بڵاوگەی پرتەویەیان»** هەر لە سەرەتای لەدایکبوون و پێڕەوکەبوونیەوە لە ساڵی ۱۳۸۱ ی کۆچی هەتاویدا ئەوە بووە کە بە پێی توانا لە بواری گەشەکردن و دەوڵەمەندکردن و پەرەپێدانی فەرهەنگی دەوڵەمەند و شکۆداری کوردستان و زیندووکردنەوەی فەرهەنگی تۆمارکراوماندا ـ کە بە راستی خاوەنی بەرهەمگەلی بەپێز و نەمری فراوان و زانا و پسپۆڕ و بلیمەتی کارامە و نەناسراوی لەژمارەبەدەرە ـ چەند هەنگاوێك هەڵگرین، هەرچەندە بچووکیش بێت.

هەرچەندە لەم ماوە کەمەدا بە لەچاپدانی ژمارەیەکی بەرچاو (نزیکەی ۱۶۰ بەرهەم لە ماوەی چوارساڵدا) هەنگاوگەلێکی بچووکمان بەرەو ئامانجی خۆمان هەڵگرتووە؛ بەڵام لەچاپدانەوەی **«فەرهەنگی مەردۆخ»** بە تەنیا خۆی کارنامەیەکی سەربەخۆ و شانازیەکی هەمیشەیی ئەندامانی زەحمەتکێشی بڵاوگەکەمانە.

ئەو کەسانەی شارەزای فەرهەنگ و وێژەی ئەم هەرێمەن باش دەزانن کە **«فەرهەنگی مەردۆخ»** بە راستی فەرهەنگێکی دەوڵەمەند و تەنیا فەرهەنگی سێ زمانەیە کە بە خامەی بلیمەتی بێوێنەی

سەردەم «**ئایەتوڵڵا شێخ موحەممەد مەردۆخی کوردستانی**» بە تەنیا و بە بێ لەبەردەستدابوونی سەرچاوەگەلی پێویست بۆ وەها کارێك لە ماوەیەکی کەمدا تۆمارکراوە و بە پێی بیرەوەری جەنابی «**عەبدولموئمینی مەردۆخ**» نوسخەی سەرەکی ئەم بەرهەمە لەگەڵ وێنە رەنگیەکانیدا بۆ یەکەم جار لەبەر چەند هۆیەکی نادیار لە «**چاپخانەی ئەرتەش**»ی ئەو سەردەمەدا ون بووە، بەڵام نووسەری کارامە و لێهاتوو و دەستڕەنگین لە ماوەیەکی کورتدا و بە یارمەتی یادداشتە کۆنەکانی و هێزی تۆقیانووسناسای خۆی جارێکی تر سەرلەنوێ ئەم بەرهەمەی نووسیوەتەوە و لە ئەنجامدا بەرهەمە دەسنووسەکەی نووسەر هەر بەو شێوەیە و بە ڕێنووسی جاران تۆفسێت کراوە کە بەداخەوە نەوەی ئەمرۆ بە هۆی شارەزا نەبوونیان لە ڕێنووسی ئەو سەردەمە زۆر کەم دەیخوێننەوە و کەڵکی لێوەردەگرن.

دوو ساڵ لەمەوبەر کاتێك پێشنیاری لەچاپ دانەوەی ئەم بەرهەمەمان بە بەڕێز «**عەبدولموئمینی مەردۆخ**» کرد و ئەوانیش بە پێشنیاری زیاد کردنی شێوە ئاخاوتنی ئەمڕۆی سۆرانی بەپیریانەوە هاتن؛ هەرگیز بیرمان لەوە نەدەکردەوە کە چ ئەرکێکی قورسمان لە ئەستۆ گرتووە و چ ڕێگایەکی پڕ لە هەڵدێرمان گرتووەتە بەر کە ئەنجامدانی وەها کارێك لە لایەن یەك کەسەوە نەك شەش مانگ بەڵکوو شەش ساڵی پێویستە... بەهەرحاڵ ئەرك و لێپرسراویەك بوو کە بەوپەڕی حەز و تاسەوە پەسەندمان کردبوو و خستبوومانە سەر شانی خۆمان، چونکە لە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانەدا چەندین کەس و تەنانەت چەندین ناوەند لە خزمەتی پاراستن و گواستنەوەی وەها شاکارێکی زانا و بلیمەتەکانیاندان، بەڵام بەوپەڕی داخ و کەسەرەوە هێشتا لەم قوژبنەی دونیادا ئەم ئاکارە نەبووەتە باو و پەرەی نەسەندووە!!

بێگومان یەکەمین هەنگاو بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە دژوارە دۆزینەوەی کەسانێك بوو کە لە هەر سێ زمانی کوردی و عەرەبی و فارسیدا ئاگادار و لێهاتوو بن و وەها کارێك ـ ئەگەر نەشیاو و نەگونجاویش نەبێت ـ زۆر دژوار بوو.

هەرچەندە مەبەستی ئێمە دەستتێوەردانی دەق و ناوەرۆکی فەرهەنگەکە نەبوو و هەرگیز شتی لەو چەشنە بە خەیاڵماندا نایەت؛ بەڵام تەنانەت بۆ نووسینەوەی دروستی وشەکانی دەسنووسەکە ـ کە هەندێکیان کاڵ بوویبوونەوە و هەندێکیشیان قرتابوون ـ پێویستمان بە کەسێکی لەو چەشنە بوو.

یەکێك لە ڕێگەچارەکان کۆکردنەوەی دەستەیەك شارەزا بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەبوو، کە بەداخەوە نە وەها هەلێکمان بۆ ڕەخسا و نە بارودۆخی ئێمەش لە ئاستی وەها هەوڵێکدا بوو و کورد وتەنی: (*ڕەوی سەخت و ئاسمان دوور*)، لە کۆتاییدا پاش چەند مانگ پەیجۆری و گەڕان بەڕێز «**عەلی ڕەحمانی**» بەڕێوەبەری «**کتێبفرۆشی ئیمام موحەممەدی غەزالی**» بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە بەڕێز «**دوکتۆر ڕەئووف**

**وەهنموون»**ی پێ ناساندین. لەبەر ئەوەی ئەوپەڕی متمانەم بە شارەزایی پێشنیارکەر و ئاگاداربوونی لە ناوەڕۆکی بەرهەمەکە و دژواری وەها کارێك هەبوو؛ هەر بۆیە پشتمان بە قسەی بەڕێزیان بەست و ئەنجامدانی ئەم کارە دژوارەمان خستە ئەستۆی بەڕێز **«وەهنموون»**. پێویستە دان بەو راستیەدا بنێم کە لە سەرەتادا وام نەدەزانی و چاوەڕوانم نەدەکرد کە ناوبراو هێندە بە وردبینی و لێهاتووییەوە شان بداتە بەر وەها لێپرسراویەك و زیاتر لەوەی کە من و جەنابی **«عەبدولمولمینی مەردۆخ»** چاوەڕوانیمان دەکرد قۆڵی هیممەتی لێ هەڵمالێت و هەموو هێز و توانای خۆی لەم رێگایەدا بخاتە کار، بە خۆشحاڵییەوە لە بواری زانستیشەوە بە هۆی پێشینەی خوێندنی خۆی لە عێراق و ئێراندا سەرمایەی پێویستی بۆ ئەنجامدانی وەها کارێك پێکەوەنابوو.

ئێمە چاوەڕوانی چاك کردن و گۆڕینی رێنووسی فەرهەنگەکە بە پێی رێنووسی ئەمڕۆی کوردی و زیادکردنی هاوواتای ئەمڕۆی سۆرانی بۆ وشە ئەردەڵانیەکان بووین، بەڵام ناوبراو بە پێی توانا لەگەڵ پاراستنی ناوەڕۆکی بابەتەکەدا بەو شێوەیەی کە شیاو و گونجاوە و بە وردبینی و تێڕامانەوە هەموو لایەنە هونەریەکانی کارەکەی لەبەرچاو گرت و چەندین جار بەسەر دەقە ئامادەکراوەکەدا چووەتەوە و هەر شتێکی بۆ پوختە بوونی چاپەکە بە باش زانیبێت پێشنیاری کردووە و خۆیشی ئەنجامی داوە، جێگەی خۆیەتی سوپاسی خۆیان و ناسێنەرەکەیان بکەین.

بڕیار وا بوو کە ئامادەکەر لە شەش مانگدا بەسەر هەردوو بەرگی فەرهەنگەکەدا بچێتەوە و ئێستا کە بەرگی یەکەمی وەردەگرینەوە نزیکەی دوو ساڵ بەسەر دەستپێکردنی مۆڵەتەکەماندا تێدەپەڕێت. بێگومان درێژکردنەوەی ئەو مۆڵەتە بە رەزامەندی و ئاگاداری بەڕێز **«مەردۆخ»** و بە پێی نیاز و پێداویست بوو، چونکە بە لامانەوە شیاو نەبوو کە بەرهەمێکی وەها بەنرخ و بەپێز تەنیا لەبەر حەز و خولیای لەرادەبەدەر بۆ لەچاپدانەوەی؛ بە شێوەیەکی سادە و هەڕەمەکی و بە هەڵەگەلێکەوە کە دەکرێت پێشگیری لێبکرێت بخرێتە بەر دەستی خوێنەران. هەر بۆیە تاڵاوی ئەو دانبەخۆداگرتنەمان بە رەزامەندیەوە نۆش کرد و بە خۆشحاڵیەوە ئەمڕۆ بەرهەمی شیرینی ئەو هەڵوێستەمان دەبینین کە بەڕاستی دەستەی لێپرسراوانی ئەم چاپە هەوڵیان داوە بەو شێوەیەی کە شایانی پلەوپایەی زانستی و فەرهەنگی وەها نووسراو و نووسەرێکە پێشکەشی فەرهەنگدۆستانی ئەم وڵاتەی بکەن، بەوپەڕی دڵنیایی و شانازیەوە دەتوانین بڵێین کە هەموو هەوڵی خۆمان بۆ گەیشتن بە وەها ئامانجێك خستووەتەکار، بەو هیوایەی جێگەی رەزامەندی پسپۆڕان و زانایان بێت...

لە کۆتاییدا جێگەی خۆیەتی لەگەڵ دەربڕینی سوپاسی دووبارەمدا بۆ ئامادەکەری هێژا؛ سوپاسی ناوەندی« **ڤیان کەمپیوتەر**»بکەم کە ئەرکی پیتچنینی سەرەتایی ئەم بەرهەمەیان لە ئەستۆدا بوو و هەروەها زۆر سوپاسی هاوکارانی زەحمەتکێشی بڵاوگەکەمان ئەکەم: خانمی«**ئیلاهە کەریمیان**» کە

هەڵەچنکردن و خانمی«**سومەیە تەیموری**»کە رازاندنەوە و ئامادەکردنی ئەم بەرهەمەیان گرتبووە ئەستۆ.هەروەها پڕ بە دڵ سوپاس و پێزانینم هەیە بۆ هەمو ئەو بەڕێزانەی دیکەیش کە لە ڕێخۆشکردن بۆ ڕەخساندنی دەرفەتی لەچاپدانەوەی ئەم شاکارە بەنرخەدا یارمەتیان داین، بە تایبەت بەڕێزان« **ئارتیکاس ئیقباڵ** » و« **نەجمەددینی موقەددەم** ».

بەو هیوایەی هەموو ئەم هەوڵانە جێگەی ڕەزامەندی فەرهەنگدۆستان و هونەرمەندان و ئەویندارانی فەرهەنگی دەوڵەمەندی کوردستان بێت و بە ڕێنماییەکانیان یارمەتیمان بدەن هەتا چاپەکانی دیکەی ئەم بەرهەمە پوختتر و گونجاوتر بێت.

**بڵاوکەرەوە**

## مقدّمه‌ای درباره‌ی شخصیت
## حضرت آیت‌الله شیخ محمّد مردوخ کردستانی

شهر سنندج در دامن کوه سرسبز آبیدر، با چشمه‌های صاف و گوارا و گل‌های خوشبوی سوسن و سنبل، مولودی را می‌طلبید که بعدها با چراغ نورانی علم و دانش، راه‌های تاریک و گرد و غبار گرفته‌ی ناشی از گذر زمان را از لوث خرافات و اوهام که اذهان عمومی را کدر و تار ساخته بود نجات دهد....

آسمان لاجوردی با ستاره‌های درخشان و شفّاف انتظار مولودی را داشت که همچو خود در آسمان علم آن روز با ستاره‌های درخشان منطق و استدلال، ضمایر تاریک را بر عاشقان حق و حقیقت روشن نماید....

در چنین شرایطی از زمان، فرزندی به سال ۱۲۹۷ هجری قمری در شهر سنندج، محله‌ی آقازمان در یک خانواده‌ی روحانی از تبار «مولانا گشایش»؛ با پیشینه‌ای هفتصد ساله

از اورامان تخت گرفته تا حسن‌آباد و شهر جدید التّأسیس سنندج، با قبول مسئولیت امامت جمعه‌ی کردستان که نسل بعد از نسل با این خانواده بوده است؛ دیده به جهان گشود و پدرش حضرت «شیخ مؤمن» به منظور تبرّک و تیمّن او را «محمّد» نام نهاد.

محمّد به حکم جبر زمان و عاطفه و مهر مادری روزها و سال‌ها را در دامان او سپری نمود تا به سن پنج سالگی رسید. در این دوران پدرش از سیمای تنها فرزند خود آثار هوش و ذکاوت را مشاهده نمود، زیرا «محمّد» دائماً با پرسش‌هایی تازه و عجیب، که درخور یک پسربچّه‌ی پنج ساله نبود، با پدر روبه‌رو می‌شد که شاید تا آن روز «شیخ عبدالمؤمن» آن را نشنیده بود. وقتی پدر تنها فرزند خانواده‌اش را چنین دید، شخصاً تعلیم و تربیت او را برعهده گرفت و با خط زیبای خود اکثر علوم را به صورت مشق برایش می‌نوشت، تا باشد فرزندش با آن هوش سرشار زودتر از انتظار به علوم زمان آگاهی یابد. امّا با کمال تأسّف دست أجل به رسم و عادت همیشگی در سنین جوانی «محمّد» را از نعمت پدر محروم نمود. اکنون محمّد تک و تنها چاره‌ای جز تلاش و کوشش نداشت، او از درآمد زمین و آسیاب و باغ کشاورزی که از پدر به ارث مانده بود، زندگانی را با رنج و زحمت می‌گذراند، با تحمّل ناملایمات مردانه ایستاد تا به آنچه که آرزو داشت جامه‌ی عمل بپوشاند.

او با استفاده از سرمایه‌ی علمی عموی بزرگوارش «شیخ عبدالرّحمان» و «شیخ محمود لون» پیشنماز مسجد آقا حبیب‌الله، مقدّمات علوم را تا «أنموذج» تلمّذ نمود. سپس با استفاده از کتابخانه‌ی پدری، شخصاً به تحقیق و مطالعه پرداخت تا آنجا که در فنون و علم و دانش و نکته‌سنجی و سخن‌پروری سرآمد اقران و محسود پیر و جوان گردید.

«محمّد» ضمن تحقیق و مطالعه به فکر اخذ مجوّز دفتر اسناد رسمی افتاد، که خوشبختانه در این راه موفّق شد و در همین دوران بود راه اصلی خود که همانا تنویر افکار بود برگزید و با توجّه به موقعیت شغلی و خانوادگی نامش بر سر زبان‌ها افتاد.

اکنون «محمّد» کیست؟ مردی که دربدر به دنبال کشف حقایق می‌گردد. با تشکیل «حزب نهضت آزادی» و پخش اعلامیه‌ها می‌کوشید مردم را از خواب غفلت و لجن‌زار خرافات و اوهامی که گرفتارش شده بودند نجات دهد. او همچنان پیش می‌رفت تا به «امامت جمعه‌ی کردستان» نیز منصوب گردید. اینجا بود که اهل علم و قلم به مقام علمی‌اش پی برده

و پروانه‌وار به گرد شمع وجودش جمع آمده و حمایتش نمودند و او با قلم و بیان و پخش کتب و رساله‌ها و با افکار تازه و نو، بر حرکت‌های غیر منطقی و غیر عقلایی و هر آنچه که بوی خرافات می‌داد خط بطلان کشید. از این‌رو مقامات آن زمان، او را از آیات الهی دانسته حکم «آیت‌الله» را هم برایش صادر نمودند، که هم اکنون این حکم در آرشیو کتابخانه‌ی خانوادگی محفوظ است...

خلاصه سخنان و نوشته‌های «محمّد» رنگی برخلاف رنگ و بوی زمان داشت، به همین دلیل کوته‌نظران، تحمّل دیدن و پذیرفتن چنین وضعی را نداشته؛ در محافل و نشست‌ها زبان به بدگویی گشودند، تا به ظنّ خود این مرد روز را، که آراء و عقایدش در تاریخ علم و دانش این سرزمین انقلابی فراهم نموده بود، از میدان به در کنند. تا آنجا که با تحریک دیگران به قصد کُشت به او تیراندازی نموده و برای کُشتنش جایزه تعیین نمودند! امّا او با برافراشتن پرچم حقایق در برابر افرادی که شستشوی مغزی شده و خرافات و اوهام همچون تار عنکبوت وجودشان را تنیده بود با جرأت و شهامت -که از خصایص نوادر روزگار است- با منطق و استدلال، در راه تنویر اذهان مشوّش و تخریب شده‌ی آنان همچنان می‌کوشید و تا واپسین دم حیات که به نود و هشت سال رسیده بود، دمی غافل نبود. آنچه را بوی حقیقت و راستی و درستی می‌داد می‌گفت و می‌نوشت و در اثبات عقاید روشن دینی و مبانی قرآن و اهل شریعت،به دور از آلودگی‌ها و خرافات، و در ترویج دین و مذهب واقعی صدر اسلام ـ که همانا تبعیّت از حضرت محمّد مصطفیﷺ و یاران وفادارش که کوتاهترین راه وصول به بارگاه احدیّت است ـ می‌کوشید و با زبانی ساده و قلمی شیوا به دور از هرگونه لفّاظی حقایق را به هم‌نوعان خود تفهیم می‌نمود.

آیت الله به‌جای پرورش شاگرد و شاگردان، چنین تشخیص داده بود این اوقات را ـ به خاطر تفسیرات و تأویلات شخصی که درباره‌ی مفاهیم دینی و مذهبی داشت ـ به تحریر و بیان حقایق و مبارزات فرهنگی، دینی و سیاسی بگذراند و همچو دیگر شخصیّت‌های روشنگر؛ هیچگاه تبلیغات مخالفین نتوانست در اراده‌ی محکم و استوار او تأثیرگذار باشد.

بدبختانه تاریخ ایران زمین گویای این واقعیت است که کوته‌نظران و خرافه‌پرستان در هر دوره‌ای از زمان نتوانسته‌اند وجود شخصیّت‌های بزرگی چون «امام محمّد غزالی» و «ابن

سینا»ها، «ابوشاکر» و «نعیمی»ها، «عین‌القضاة همدانی» و «خیّام نیشابوری»ها و... را تحمّل کنند،غافل از اینکه گذشت روزگاران بهترین محک شناسائی و معرفی آنان خواهد بود.

به سوگند خوردن که زر مغربی است　　چه حاجت؟ محک خود بگوید که چیست

پدرم در شهر کوچک سنندجِ آن زمان، از بدگویی‌ها و تبلیغ‌های ناروای افراد بی‌مایه مصون نبود، امّا بحمد الله با گذشت زمان و ورود افکار روشن و جدید، مردم قدرش را شناخته و مشتاقانه نوشته‌هایش را صراف‌وار خریدند. طبقات روشنفکر به ویژه سخن‌پردازان معانی و اهل انصاف قیام نموده و با شعر و نثر حمایتش نمودند. که بی‌مناسبت نمی‌دانم به طور مختصر به گوشه‌هایی از کلام حق‌جویانه‌ی آن بزرگواران واقع‌بین اشاره کنم:

**گلشن کردستانی:**

آیت‌الله را به سر افکار رنگارنگ نیست
جز دفاع از حق ورا با کس هوای جنگ نیست

غیر مجذوب حقیقت، نیست پابند کسی
طعنه‌ی ناکس به سمعش سخت‌وزشت‌وننگ نیست

آیت ار گامی نهد در شاهراه حق نهد
مرد دانا را نیازی بر سپاه و هنگ نیست

**مهرآور:**

آیت‌الله در جهان از هیچ کس دلتنگ نیست
چون که سودایش حق است و او به فکر جنگ نیست

او به ضرب حق‌نویسی کاخ دین محکم کند
گرچه او را غیر کلک و خامه، خشت و سنگ نیست

او بوَد جویای حق، پویای حق، گویای حق
شیر جویا را تجسّس بر شکارش، ننگ نیست

او ادیب و اوستاد و فاضل و دانشوَر است

جاهلان را با ادیبان همسری و رنگ نیست

ناز شستت آیت‌الله! چون‌که در مُلک سخن

در کلامت مکر و شید و خُدعه و نیرنگ نیست

**خاکی کردستانی:**

آیت‌الله را نشاید با دگرها برد نام

پخته‌ی علم است او مر دیگران جهال و خام

هر کسی بر ضد او برخیزد از بیچارگی است

کی جمال صبح روی او خلل یابد ز شام؟

آیت‌الله راه حق را واضح و روشن کند

چون طلوع صبح گوشش بر خروس بام نیست

ما سخن از روی دانش می‌پسندیم و خِرَد

ورنه هر افسانه‌گویی نزد ما بهنام نیست

**روشنی کردستانی:**

ای ز علم عالی‌ات چشم مسلمان روشن است

نکته‌ها گفتی که هریک لایق صد احسن است

جاهلان از نور علم تو از آن رَم می‌کنند

فطرت خُفّاش اصلاً نور خور نادیدن است

**بدیع کردستانی:**

آیت‌الله یار خوش‌گفتار

به خدا دوستدارست بسیار

زآنکه در فطرت تو می‌بینم

خُلق نیکان و شیوه‌ی ابرار

در کلام و بیان و حکمت تو

پایه‌ی دانشت شود اظهار

تـو شهنـشاه کـشور سـخنی | صفحـات قلمـروت آثـار
زرّ نـابی ولـی دو صـد افسوس | گشته‌ای کـم‌بهـا در ایـن بـازار
گنج پرگوهری در ایـن کـشور | لیک گشته است پاسبانت مار

به هر صورت هرکس به ظن و اندازه‌ی وسعت فکری و پندار خـویش از درون ناشـناخته‌ی آنان خبر دارد. کسانی که به راز و رمز دنیای طبیعیّات و ریاضیات پی نبرده‌اند چطور می‌توانند شخصیت‌های علمی این دنیای پیچیده را شناسایی و معرفی کنند؟ و یـا اشخاصـی کـه از الفبـای فلسفه و عرفان فقط نامی شنیده، کورکورانه دنباله‌رو دیگرانند کَی مـی‌تواننـد دربـاره‌ی دریـای ژرف و شخصیت‌های عرفانی و فلسفه بحث و گفتگو کنند؟...

قصّه‌ی امواج دریا را باید ز دریا دیده پرسید | زیـرا هر دلـی آگه ز طـوفان دریا نیست

کسانی که فقط به منظور مدح و ثنا و طلب روزی از این و آن قلم بر کاغذ می‌کشند، کَی از شب‌زنده‌داری‌های نویسندگان و محقّقان خبر دارند؟ «تو که اندر بزم وصلی درد هجـران را چه می‌دانی؟»

چون بعضی از مردمان زمان، از قافله‌ی پیشرفت فکری و ذهنـی پیـشگامان و روشـنفکران فاصله داشتند؛ نتوانسته‌اند روح‌های حسّاس و واقع‌بین آنان را بشناسند، با نائره‌ی بخل و حـسد، آتش بر جسم و جان خود می‌نهادند. که پدرم در زمان حیات از این‌گونه کوته‌نظری‌هـا بـه‌دور و دمی از بدگویی و نیش زبان مخالفین در امان نبـود، ولـی چـون راه حـق و حقیقـت را در پـیش داشت تا دم آخر در پیمودن راهی که انتخاب نموده بود سستی به خود راه نداد و بـه قـول خـود به دیدن مرگ هم شایق است اما مرگ از او فرار می‌کند:

من به دل شایـقم به دیدن مـرگ | مرگ از من نهاده رو بـه فـرار
گـر مـرا اهـل بغـی ارّه کـشـند | یـا مرا بیفکننـد انـدر نـار
راه من حق‌روی است و حق‌گویی | با زمـین و زمـان نـدارم کـار

آری با این عزم و اراده بعد از گذشت نود و هشت سال عمـر پربـار و بـا برجـای گذاشـتن

یکصد و بیست جلد کتاب و رساله‌های چاپ شده و چاپ نشده، امر حق را طبق پیش‌بینی خود، در سال ۱۳۵۴ شمسی روز ۲۱ شهریور برابر با پنجم ماه مبارک رمضان لبّیک گفته، به سرای جاوید شتافت. جوانان پرشورکُرد و مردان و زنان باوفای کُردستان با پای پیاده جنازه‌اش را تا بیست کیلومتری شهر سنندج در روستای «لوره» استراحتگاه تابستانی‌اش مشایعت نموده که به اقرار رادیو و تلویزیون و روزنامه‌ها جمعیت مشایعت‌کننده بالغ بر هشتاد و پنج هزار نفر تخمین زده شد.

در حقیقت معرفی چنین شخصی با داشتن این همه آثار در تمام رشته‌ها، عقلایی به نظر نمی‌رسد و آنچه من نوشته‌ام فقط به خاطر آن دسته از جوانان روشنفکر این زمان است چون ممکن است آن طور که شاید و باید با این شخصیت ماندگار و شهیر آشنایی نداشته باشند.

یکی از آثار ایشان «فرهنگ مردوخ» است که با کمبود امکانات آن زمان و با زحمات شبانه‌روزی آن را با سه زبان به چاپ رسانید و چون تیراژ آن کم بود متاسّفانه همگان نتوانستند از آن استفاده کنند، تا اینکه به پیشنهاد جوان برومند و عزیزم جناب «پرتوی» مدیر انتشارات «پرتو بیان» تصمیم به تجدید چاپ گرفته شد، مشروط به اینکه با استفاده از نظر استادان، لهجه‌ی اصلی کردی سورانی هم به آن اضافه شود،که خوشبختانه این آرزو به حقیقت پیوست. هم اکنون فرهنگی که در دست‌های شما عزیزان قرار دارد با زبان‌های کُردی «سورانی و اردلانی»، فارسی و عربی به چاپ رسیده است که شاید در دنیای علم و دانش چنین فرهنگی با چهار زبان کم‌نظیر باشد. لذا جا دارد قلباً از دلسوزی و علاقمندی دوست محترم و عزیز جناب «یحیی پرتوی»که واقعاً آراسته به تمام محسنات انسانی و فرهنگ دوستی است تشکّر کنم همچنین از استاد دکتر «رئوف رهنمون» که در بازنگری و اضافه نمودن لغات سورانی با اسلوب جدید زحمات فراوانی را متحمّل شده‌اند نهایت تشکّر و سپاس را داشته و توفیق کلیه‌ی دست‌اندرکاران را که در راه تجدید چاپ این فرهنگ زحمت کشیده‌اند از خداوند بزرگ تمنّا می‌نمائیم.

در خاتمه چند بیت از مرثیه‌ی پراحساس و جانکاه استاد «ناصر روشن» را که در روز تشییع جنازه با صدای رسا و مردانه بر مزار پدرم قرائت نمودند به نظر خوانندگان عزیز می‌رساند:

نشسته خاک ماتم بر سر و سیمای کردستان
همه‌جا خار غم روییده در صحرای کردستان

بنالد بلبل شیدا بگرید ماهی دریا
فلک را گوش کر باشد از این غوغای کردستان

ز بس از چشم این مردم، سرشک غم فرود آمد
نشسته در گل محنت، ز سر تا پای کردستان

برفت از آسمان ما درخشان آفتاب ما
سیه مانند شب باشد یقین فردای کردستان

به فقه و فلسفه استاد، هم بر منطق و تاریخ
روا باشد که گویندش بهین آقای کردستان

اگرچه رفته از دیده، نخواهد رفت از دل‌ها
بود بعد از وفات او همین ایفای کردستان

**عبدالمؤمن مردوخ آیت‌الله‌زاده‌ی کردستانی**

**حدیث نیک و بد نوشته خواهد شد زمانه را ورقی و دفتری و دیوانی است**

## کورتەیەك لە بارەی کەسێتی جەنابی
## ئایەتوڵڵا شێخ موحەممەد مەردۆخی کوردستانیەوە

شاری سنە لە داوێنی چیای سەوزی ئاویەردا بە چاوگە روون و سازگارەکانیەوە و بە گوڵە بۆنخۆشەکانی سۆسەن و سونبولیەوە چاوەڕوانی کۆرپەیەك بوو کە لە داهاتوودا بە چرای روونـاکی زانست و زانیاری خۆی، رێگەکەلی تاریکونووتەك ـ کە تەپوتۆزی تێپەڕینی رۆژگاری لێ نیشتبوو ـ لە چەپەڵی ئەو بیروبۆچوونە پڕوپووچگەلەی ـ کە زەینی کۆمەڵانی خەڵکی تاریك و تەڵخ کردبوو ـ رزگار بکات و پاك بکاتەوە...

ئاسمانی شین بە ئەستێرە روونـاك و تریفەدارەکانیەوە، چاوەڕوانی کەسێك بوو کە خۆی ئاسایی لە ئاسمانی زانستی ئەو رۆژگارەدا بە ئەستێرەگەلی تریفەداری لۆژیك و ئاوەزخوازی، هەناوە تاریکەکان بۆ ئەویندارانی راستی روونـاك بکاتەوە...

لە وەها کاتێکدا منداڵێك لە ساڵی ۱۲۹۷ی کۆچی مانگی [ ۱۸۸۰ی زایینی] لە شاری «سنە»، گەڕەکی «ئاغەزەمان» لە بنەماڵەیەکی ئایینیدا ـ کە دەچنەوە سەر «مەولانا گوشایش» و بە

پێشینەیەکی ٧٠٠ ساڵیەوە لە هەورامانی تەختەوە تا حەسەناوا و شاری تازە ئاوەدانکراوەی سنە، کە پشتاوپشت ئەرکی پێشنوێژی و وتاردانی ڕۆژی هەینیان لە ئەستۆدا بووە ـ لە دایك دەبێت و باوکی «جەنابی شێخ موئمین» لەبەر پیرۆزبوون ناوی «**موحەممەد**»ی بۆ هەڵدەبژێرێت.

موحەممەد بەپێی خواستی ڕۆژگار تا پێنج ساڵەیی لە سایەی سۆزی دایکیدا بەسەر برد. هەر لەو تەمەنەدا باوکی لە ناوچاوی تەنیا ڕۆڵەکەیدا شوێنەواری زیرەکی و هۆشیاری بەدیکرد، چونکە موحەممەد هەمیشە بە پرسیارگەلی نوێ و سەرسوڕهێنەرەوە ـ کە لە ئاستی تێگەیشتنی منداڵێکی پێنج ساڵاندا نەبوو و لەوانەیە عەبدولموئمین تا ئەو ڕۆژە شتی وای نەبیستبێت ـ ڕووبەڕووی باوکی دەبووەوە. کاتێك باوکی ئەم هەموو بەهرەیەی لە منداڵەکەیدا بەدیکرد، خۆی فێرکردن و بارهێنانی گرتە ئەستۆ و بە خەتی خۆشی خۆی زۆربەی بابەتە زانستیەکانی بە سەرمەشق بۆ دائەدا بەو هیوایەی منداڵەکەی بەو هەموو زیرەکیەوە زووتر لە هاوساڵانی شارەزای زانستی سەردەم ببێت. بەڵام بەوپەڕی داخ و کەسەرەوە دەستی ئەجەل بە پێی دابونەریتی هەمیشەیی خۆی موحەممەدی لاوی لە نازی باوك بێبەش کرد و ئیتر موحەممەدی بێکەس و تەنیا جگە لە هەڵمالینی قۆڵی هیممەت، ڕێگەیەکی تری لەبەردەمدا نەبوو، هەر بۆیە لە داهاتی ئەو زەوی و ئاش و باخەی کە لە باوکیەوە بۆی بەجێمابوو ژیانی پڕ لە کوێرەوەری دەبردە سەر و ئازایانە شانی دایە بەر ئەرك و ڕەنجی ڕۆژگار هەتا ئاواتەکانی بهێنێتە دی.

موحەممەد بەهۆی سەرمایەی زانستیی مامەی بەڕێزی «**شێخ عەبدوڕڕەحمان**» و هەروەها «**شێخ مەحموودی لۆن**» پێشنوێژی مزگەوتی «ئاغەحەبیبەڵڵا»، سەرەتای زانستە ئایینیەکانی هەتا نامیلکەی «**ئونموزەج**» خوێند و پاشان لە کتێبخانەکەی باوکیدا خۆی دەستی دایە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوە، هەتا لە هونەر و زانست و وردبینی و حازرجوابی و ڕەوانبێژیدا وەها هاوساڵانی خۆیی بەجێهێشت کە لاو و پیر ئێرەییان پێ دەبرد.

موحەممەد لەگەڵ لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەدا هەوڵی دا کە مۆڵەتی دانانی تۆمارگەی یاسایی قەباڵە و تاپۆ (دەفتەری ئەسنادی ڕەسمی) وەربگرێت و بە خۆشحاڵیەوە هەوڵەکەی گەیشتە ئەنجام و هەر لەم سەردەمەدا بوو کە شارێگەی ژیانی ـ کە بریتی بوو لە ئاوەزخوازی و ڕۆشنگەری ـ گرتەبەر و بەهۆی پلەوپایەی پیشەیی و بنەماڵەییەوە ناوی کەوتە سەر زمانی خەڵکی.

ئێستا موحەممەد کێیە؟ مرۆڤێك کە بە دوای دەرخستنی ڕاستیەکاندا وێڵانە، لە ڕێگەی بنیاتنانی «**حیزبی ڕاپەڕینی ئازادی** (نهضت آزادی)» و بڵاوکراوەکانیەوە هەوڵی دەدا خەڵکی لە خەوی بێئاگایی و لیتەی بیروبۆچوونی پڕوپووچ ڕزگار بکات و بەم شێوەیە درێژەی بە تێکۆشان دەدا هەتا پلەی «**پێشنوێژ و وتاردەری هەینی**»شی پێدرا. بیرمەندان و زانیاران بەهۆی ناسینی پلەوپایەی زانستیەوە وەکوو پەپوولە لە دەوری دەگەڕان و پشتیوانیان دەکرد و ئەویش بە قەڵەم و زمان و نووسین و بڵاوکردنەوەی کتێب و نامیلکە

و بە هزری تازە و نوێوە بەگژ جموجوولّە دوور لە ئاوەز و پڕوپووچخوازەکانـدا دەچـوو و پووچـی دەکردنـەوە. هەربۆیە کاربەدەستانی ئەو سەردەمە ئـەویان بـە نیشانەیەکی خـودا دەزانـی و پلـەی «ئایـەتوڵلا»ییـشیان پێبەخشی, کە ئێستەش ئەم فەرمانە لە ئەرشیڤی کتێبخانەی بنەماڵەی مەردۆخدا پارێزراوە...

بە کورتی وتار و نووسـراوەکانی موحەممـەد رەنـگ و بۆیـەکی تـری هێنایـە ئـاراوە، هەربۆیـە مرۆڤـە بیرتەسکەکان ئەم بارودۆخەیان پێ پەسەند نەکرا و لە کـۆڕ و کۆبوونەوەکانـدا دەسـتیان دایـە خراپەوێژی و زماندرێژی, هەتا بە خەیاڵی خاوی خۆیان ئەم پیاوە ـ کە بیر و بۆچوونەکانی شۆڕشێکی لە مێژووی زانست و زانیاری ئەم وڵاتەدا بـەرپاکردبوو ـ لـە ئـارادا نـەهێڵن، تەنانـەت بەوەشـەوە نەوەسـتان و دەسـتیان دایـە هاندانی خەڵکی و بە قەستی کوشتنەوە دایانـە بـەر گوللـە و خـەڵاتیان بـۆ کوشـتنی دیـاری کـرد! بـەڵام ئایەتوڵلا بە هەڵکردنی ئاڵای هەقخوازی لە بەرامبەر ئەو کەسانەوە کە مێشکیان شۆردرابووەوە و پڕوپووچ و ئەفسانە وەکوو داوی جاڵجاڵۆکە هەناویانی تـەنیبوو, بەوپـەڕی بـوێری و نەترسیەوە ـ کـە تایبەتمەنـدیی کەڵەپیاوانی رۆژگـارە ـ بـە لۆژیـك و ئاوەزخوازیـەوە هـەر لـە تێکۆشـاندا بـوو، بـەڵکوو زەیـنی شـێواو و تێکدراویان رووناك بکاتەوە و هەتا دوایین هەناسەی ژیانی نەوەد و هەشت سـاڵەی چـاوتروکانێك پـشووی نەدا. ئەوەی کە هەق و راستی بوایـە دەیـوت و دەینووسـی و لـە پێنـاوی سـەلماندنی بیروبـاوەڕی روونـاکی ئایینی و بنەماکانی قورئان و رێبازی پاکژی ئایینی دوور لە خڵتە و پڕوپووچ و لە پێناوی برەودان بە ئـایین و رێبـازی راستەقینەی سـەرەتای ئیـسلام ـ کـە پـەیڕەوی کردنـی حـەزرەتی موحەممـەد (د.خ) و هاوەڵـە وەفادارەکانیەتی کە کورترین و شارێگەی گەیشتنە بارەگای خودایـە ـ بـە زمـانێکی سـادە و قەڵـەمێکی رەوان و دوور لە هەر قسەیەکی بێ ناوەرۆك تێدەکۆشا و هاووڵاتیەکانی شارەزای راستیەکان دەکرد.

ئایەتوڵلا وای بە باش دەزانی کە لەباتی بارهێنانی قوتابی ـ بە هـێزی راڤـە و بۆچـوونە تایبەتیـەکانی خۆیەوە سەبارەت بە چەمکە ئایینی و ئایینزاکان ـ کاتی خۆی بۆ نووسین و دەربڕینی راستیەکان و چالاکی فەرهەنگی و ئاییـنی و سیاسی, تەرخان بکات و وەکوو هەموو کەسـێتیە رۆشـنگەرەکانی مێـژوو هـەرگیز پڕوپاگەندەی نەیاران نەیتوانی هەڵوێست و بڕیاری پۆڵایینی نەرم بکات.

بە داخەوە مێژووی وڵاتی ئێران ئەم راستیە دەردەخات کە مرۆڤە بیرتەسـك و پڕوپـووچخوازەکـان لـە هیچ قۆناغێکـدا نـەیانتوانیوە لەگـەڵ بـوونی کەسـێتیە گـەورە و ناودارەکـانی وەك «**ئیمـام موحەممـەدی غەزالی**» و «**ئیبنوسینا**»کان و «**ئەبووشاکر**» و «**نەعیمی**»کـان و «**عـەینولقوزاتی هەمـەدانی**» و «**خـەیامی نەیشابووری**»کان و... بسازن و بێدەنگ بن و هەمیشە لەم راسـتیە بـێئاگـا بـوون کـە تێپـەڕینی رۆژگـار باشترین مـەحەك و ناسێنەرە.

«بێخەوشی ئاڵتوون سوێندی پێناوێ          مەحـەکی بەسـە، لیکـەرێ تـاوێ»

باوکم لە شاری بچووکی سنەی ئەو کاتەدا, لە دەم و زمان و پڕوپاگەندەی ناڕەوای مرۆڤە هیچوپووچ و بێمایەکان پارێزراو نەبوو، بەڵام سوپاس بۆ خوا تێپەڕینی کات و پەرەسەندنی بیروبۆچوونی ڕووناك و نوێ بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکی قەدری بناسن و بە تاسە و حەزەوە نووسراوەکانی وەکوو زێڕ و گەوهەر بقۆزنەوە. توێژە ڕۆشنبیرەکان، بەتایبەت مرۆڤە گەوهەرناس و دادخوازەکان، ڕاپەڕین و بە هۆنراوە و پەخشان پشتیوانیان لیّکرد کە جێگەی خۆیەتی بە کورتی بەشێك لە وتەی هەقخوازانەی ئەو بەڕێزە وردبینانە بخەینە بەرچاو:

**گوڵشەنی کوردستانی:**

**آیـــت‌الله را به سر افــکار رنگارنـگ نیـست**

**جز دفاع ز حق ورا بـا کـس هـوای جنـگ نیـست**

**غیـــر مجـذوب حقیقت، نیـست پابنـد کـسی**

**طعنه‌ی ناکس به سمعش سخت‌وزشت‌وننگ نیست**

**آیـــت ار گـــامـی نهد در شـــــاهراه حـق نهـد**

**مـرد دانـــا را نیـــازی بر سـپاه و هنـــگ نیـست[1]**

**میهراوەر:**

**آیـت‌الله در جهـان از هـیچ کـــس دلتنـگ نیـست**

**چون که سودایش حق است و او به فکر جنگ نیست**

**او به ضرب حـــق‌نویـسی کـاخ دیـن محکـم کنـد**

**گرچه او را غیر کلک و خامه، خشت و سنگ نیست**

**او بودَ جویای حق، پـــویای حق، گـــویای حق**

**شـــیر جویا را تجـسّس بـر شکـــارش، ننـگ نیـست**

**او ادیــــب و اوســــتاد و فاضـل و دانـشورَ اسـت**

**جاهـلان را بـا ادیبـــان همـســـری و رنـــگ نیـست**

---

١ـ ئایەتوڵڵا یەکڕەنگە و بیروبۆچوونی ڕەنگاوڕەنگی لەسەردا نیە و جگە لە هەقخوازی ئامانجێکی نیە و لە شەڕخوازی بە دوورە.
جگە لە راستی شوێنکەوتووی کەس نیە و تانەی ناکەسانی بەلاوە گران و ناشیرین و نەنگ نیە.
ئایەتوڵڵا لە شارێی هەقدا هەنگاو دەنێت و مرۆڤی زانا پێویستی بە سوپا و لەشکر نیە.

ناز شستت آیت‌الله! چون که در مُلک سخن

در کلامت مکر و شید و خُدعه و نیرنگ نیست[1]

**خاکی کوردستانی:**

آیت‌الله را نشاید با دگرها برد نام

پخته‌ی علم است او مر دیگران جهال و خام

هر کسی بر ضد او برخیزد از بیچارگی است

کی جمال صبح روی او خلل یابد ز شام؟

آیت‌الله راه حق را واضح و روشن کند

چون طلوع صبح گوشش بر خروس بام نیست

ما سخن از روی دانش می‌پسندیم و خرَد

ورنه هر افسانه گویی نزد ما بهنام نیست[2]

**ڕەوشەنی کوردستانی:**

ای ز علم عالی‌ات چشم مسلمان روشن است

نکته‌ها گفتی که هریک لایق صد احسن است

جاهلان از نور علم تو از آن رَم می‌کنند

فطرت خُفّاش اصلاً نور خور نادیدن است[3]

---

[1]ـ ئایەتوڵڵا لە جیهاندا لە هیچ کەس دلگران نیە، چونکە هەقخوازە و لە بیری شەڕخوازیدا نیە.
ئەو بە لێدانی سکەی هەق کۆشکی ئایین دادەمەزرێنێت، هەرچەندە جگە لە قەڵەم، خشت و بەردی لەبەر دەستدا نیە.
ئەو هەقخواز و هەقبێژە و ڕێگای هەق دەگرێتە بەر و هەرگیز گەڕان بە دوای نێچیردا بۆ شێری چالاك عەیب نیە.
ئەو ئەدیب و ئوستاد و بەڕێز و زانایە، نەزانەکان هەرگیز نابنە هاودەمی ئەدیبان.
دەستت نەڕزێت ئەی ئایەتوڵڵا! چونکە لە وڵاتی ئەدەبدا هیچ فرۆفێڵ و گزی و فریودان لە قسەتدا نیە.

[2]ـ ڕەوا نیە ناوی ئایەتوڵڵا لەگەڵ ناوی کەسانی تردا ببرێت، چونکە ئەو لە زانستدا خاوەنئەزموونە و کەسانی تر نەزان و پێنەگەیوون.
هەرکەس لە بەرامبەر ئەوەوە ڕاست بێتەوە بێچارەیە، چونکە قەت جوانی بەرەبەیانی ڕووی ئەو ئێوارەی بەسەردا نایەت.
ئایەتوڵڵا ڕێگەی هەق ڕووناك دەکاتەوە، چونکە ڕۆژبوونەوە بە خوێندنی کەڵەشێری سەربان نیە.
ئێمە لە ڕووی زانایی و ئاوەزەوە قسە پەسەند دەکەین، دەنا هەر ئەفسانەبێژێك بە لای ئێمەوە خۆشناو (بهنام) نیە.

[3]ـ ئەی ئەو بەڕێزەی کە زانستی بەپێزت مایەی ڕۆشنی چاوی موسوڵمانانە، گەلێك قسەی ورد و سەرنجڕاکێشت کرد کە هەرکامیان شیاوی سەدان ئافەرینە.
نەزانان بۆیە لەگەڵ تیشکی زانستی تۆدا سازگار نین، چونکە سروشتی شەمشەمەکوێرە لە بنەڕەتدا نەبینینی تیشکی هەتاوە.

بەدیعی کوردستانی:

| | |
|---|---|
| آیـــت‌الله یـــار خـــوش‌گفتـــار | بـه خـدا دوستدارسـت بـسیار |
| زآنکه در فطرت تـو مـی‌بیـــنم | خُلـق نیکـان و شیـــوەی ابـرار |
| در کلام و بیان و حکمـت تـو | پایـــه دانـــشت شـود اظهـــار |
| تــو شهنـــشاه کـشور ســخنی | صفحـــات قلمـــروت آثــــار |
| زرّ نـابی ولـی دو صـد افـسوس | گـشتەای کـم‌بهـا در ایـن بـازار |
| گنج پر گوهری در ایـن کـشور | لیک گشته است پاسبانت مار[1] |

بەهەرحاڵ هەرکەس بەپێی زانیاری و ئاسۆی بیروبۆچوونی خۆی لایەنە نەناسراوەکانی ئـەو بیرمەندانـە ئاشکرا دەکات. ئەوانەی کە ئاگایان لە راز و نهێنی زانستە سروشـتیەکان و بیرکـاری نیـە چـۆن دەتـوانن کەسێتیە زانستیەکانی ئەم جیهانە ئاڵۆزە بناسن و بناسێنن؟ ئەوانەی کە تەنیا ناوی ئەلفوبێی خواناسـی و فەلسەفەیان بیستووە و کوێرانە دەبنە شوێنکەوتەی خەڵکی، چۆن دەتوانن دەریای قووڵ و بێ‌بنی کەسێتیە خواناس و فەیلەسووفەکان بخەنە بـەر بـاس و لێکۆڵینـەوە؟ «داسـتانی شـەپۆلی دەریـا لای کەشـتیوانی بەئەزموونە، چونکە هەر دڵێك ئاگای لە گەردەلوولی دەریا نیە». ئەوانـەی کـە تـەنیا بـۆ پەسـن‌کـردن و پیاهەڵگوتن و دەست پان‌کردنەوە لەم و لەو قەڵـەم دەخەنـە سـەر کاغـەز کـەی ئاگایـان لـە نەخـەوتن و شەونخوونی نووسەران و توێژەرانە؟

**«تۆ کە لە کۆڕی گـەرمی یاراندای چووزانی چۆنە دەردی جودایی؟»**

هەنـدێ لـە خـەڵکی سـەردەم چـونکە لـە کـاروانی پێـشکەوتنی هـزری و زەیـنی پێـشەنگەکان و رۆشنبیرەکان بە دووربوون، نەیانتوانیوە رۆحی ناسك و وردبینی ئەو بیرمەندانە بناسن, هەربۆیە بە ئـاگری ئێرەیی و بەرچاوتەنگی لە راستیدا لاشە و گیانی خۆیان دەسووتاند. باوکم لە سەردەمی ژیانیدا ساتێك لە چزووی زمانی نەیارانی بیرتەسك بە دوور نەبوو، بەڵام چونکە رێگەی هەق و راستی گرتبووە بەر تا ئاخرین

---

[1] ـ ئایەتوڵڵا، ئەی دۆستی قسەشیرین، بە خوا زۆر خۆشەویستیت.
چونکە رەفتاری چاکان و شێوازی پاکان لە سروشتی تۆدا دەبینم.
پلەی زانستت لە رتار و قسە و کارزانیتدا دەردەکەوێت.
تۆ پادشای وڵاتی ئەدەب و وێژەیت و پەرەپەرەی شوێنەوارەکانت وڵاتی تۆیە.
زێری بێ‌خەوشی بەڵام بە هەزار داخ و کەسەرەوە لەم بازارەدا بێ‌ترخیت.
گەنجینەی پڕ لە گەوهەری ئەم وڵاتەی بەڵام مار بوودتە پاسەوانت.

هەناسە لە گرتنەبەری ئەو ڕێگەیە پاشگەز و دڵسارد نەبوویـەوە و تەنانـەت بـە پێـی فەرمایـشی خـۆی ئارەزوومەندی دیداری مەرگ بوو بەڵام مەرگ خۆی لەو دەپاراست:

| | |
|---|---|
| من به دل شايقم به ديدن مـرگ | مرگ از من نهاده رو بـه فـرار |
| گـر مـرا اهـل بغـى ارّه كـشـند | يـا مرا بيفكننـد انـدر نـار |
| راه من حق‌روى است و حق‌گويى | با زمين و زمـان نـدارم كـار[1] |

بەڵێ بەم بڕیارە دامەزراو و ورە بەرزەوە پاش تێپەڕینی ٩٨ ساڵ تەمەنی پـڕ بەرەکـەت و نووسـینی ١٢٠ کتێب و نامیلکەی چاپکراو و چاپنەکراو، بەپێی پێشبینی خـۆی، لـە سـاڵی ١٣٥۴ی کۆچـی هەتاوی [١٩٧٥/٩/١٣]، لە ڕۆژی ٢١ی خەرماناندا کە پێنجەمین ڕۆژی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان بـوو ئەمری خوای بەجێهێنا و بەرەو ماڵی هەمیشەیی کۆچی دوایی کرد. لاوانی خوێنگەرم و ژنان و پیـاوانی ئەمەکناسی کوردستان، بە پێ تەرمەکەیان هەتا لادێی **«نەوەرە»** ـ کـە هاوینەهـەواری ئایـەتوڵڵا بـوو و بیست کیلۆمەتر لە سنەوە دوورە ـ بەڕێ کرد، کـە بـە پێـی هـەواڵی ڕادیـۆ و تەلـەفزیۆن و ڕۆژنامـەکان ژمارەیان لە هەشتاوپێنج هەزار کەس تێدەپەڕی.

لە ڕاستیدا ناساندنی کەسێکی وەها ناودار، کە ئەو هەموو بەرهەمەی لە هەموو لقەکانی زانستدا لە پاش خۆی بەجێهێشتووە، کارێکی بێهوودەیە و ئەم پێشەکیە تەنیا بۆ لاوانی ڕۆشنبیری سەردەم نووسراوە کە لەوانەیە بەو شێوەیەی کە شیاوە ئەم کەسێتیە بەناوبانگ و نەمرە نەناسن.

یەکێك لە بەرهەمەکانی ناوبراو **«فەرهەنگی مەردۆخ»** کە لە سـەردەمێکدا کـە ئـامرازی پێویـست لەبەردەستدا نەبووە و بە ئەرك و زەحمەتی شەو و ڕۆژی، بە سێ زمـان لـە چـاپی داوە و بەداخـەوە لەبـەر کەمبوونی ئەژمارەکەی نەکەوتبووە بەردەستی هەموو خوێنەران، هـەتا بـە پێـشنیاری لاوی خوێنگـەرم و ئازیز جەنابی **«پەرتەوی»** بەڕێوەبەری بڵاوگەی **«پرتەوبەیان»** بڕیار درا کە سەرلەنوێ لە چاپ بدرێتەوە، بەو مەرجەی کە بە ڕێنمایی زانیاران شێوە ئاخاوتنی سـەرەکی کـوردی سۆرانیـشی پـێ زیـاد بکرێـت و بـە خۆشحاڵیەوە ئەم ئارەزووە هاتە دی و ئەم فەرهەنگەی لەبەردەستی ئێوەی ئازیزدایە ـ جگە لە دوو زمـانی عەرەبی و فارسی ـ دوو شێوە ئاخاوتنی سەر بە دیالێکتی سۆرانی لەخۆگرتووە، کە لەوانەیە لـە جیهـانی زانستدا وەها فەرهەنگێك کە ئەو زمانانەی لەخۆگرتبێت نایاب بێت، بۆیە جێگەی خۆیەتی لە ناخی دڵەوە سوپاسی دڵسۆزی و تامەزرۆیی هاوڕێی بەڕێز وئازیزم جەنابی **«یەحیا پەرتەوی»** ـ کە بەڕاستی بـە هـەموو

---

| | |
|---|---|
| ١ـ [(من تاسەباری دیداری مەرگم | مـەرگ ڕادەکا لـە دیداری من |
| گەر ستەمـکاران لەتویـەتم کەن | یـا بخەنـە ناو ئاگری دوژمن |
| زەمین و زەمـان نامگێرێتـەوە | نە لە هەقخوازی نە لە هەقوتن)] |

جۆرە زێوەرێکی مرۆڤایەتی و فەرهەنگدۆستی رازاوەتەوە ـ بکەم و ئەوپەڕی سوپاسی دوکتۆری زانا **«رەئووف رەهنموون»** بکەم کە بۆ پیاچوونەوە و خستنەسەری هاوواتای سۆرانی بە پێی شێوازی سەردەم ئەرك و رەنجی زۆریان کێشاوە و سەرکەوتنی هەموو کاربەدەستانی بڵاوگەی **«پرتەوبەیان»** کە لە پێناوی لە چاپدانەوەی ئەم فەرهەنگەدا زەحمەتیان کێشاوە لە خوای گەورە داواکەم.

لە کۆتاییدا بەشێك لە شینگێڕی بە سۆز و دڵتاوێنی ئوستاد **«ناسری رەوشەن»** کە لە رۆژی ئەسپەردەکردنی باوکمدا بە دەنگی زوڵاڵ و پیاوانەی خۆی لەسەر مەرقەدەکەیدا خوێندیەوە پێشکەشی خوێنەران دەکەم:

نشسته خاک ماتم بر سر و سیمای کردستان
همه‌جا خار غم روییده در صحرای کردستان

بنالد بلبل شیدا بگرید ماهی دریا
فلک را گوش کر باشد از این غوغای کردستان

ز بس از چشم این مردم، سرشک غم فرود آمد
نشسته در گل محنت، ز سر تا پای کردستان

برفت از آسمان ما درخشان آفتاب ما
سیه مانند شب باشد یقین فردای کردستان

به فقه و فلسفه استاد، هم بر منطق و تاریخ
روا باشد که گویندش بهین آقای کردستان

اگرچه رفته از دیده، نخواهد رفت از دلها
بود بعد از وفات او همین ایفای کردستان[1]

**عەبدولموئمین مەردۆخ ئایەتوڵلازادەی کوردستانی**

**«چاکە و خراپەی قەت لێ ون نابێ          رۆژگار دەفتەر و دیوانی هەیە»**

---

١ـ خاکی ماتەم لە سەروچاوی کوردستان نیشتووە و دڕکی خەم لە سەرتاسەری سارای کوردستاندا رواوە.
بولبولی شەیدا دەناڵێنێت و ماسی زەریا دەگری، کەچی گوێی فەلەك لە بەرامبەر ئەم شیوەن و زاریەی کوردستانەوە کەڕە.
ئەوەندە فرمێسکی خەم لە چاوی ئەم خەڵکەوە دارژا کە سەرتاپای کوردستان بە قوڕی نەهامەتیدا رۆچوو.
هەتاوی رووناکی ئێمە ئاسمانەکەمانی بەجێهێشت و ئیتر بێگومان بەیانیی کوردستان وەکوو شەوەزەنگ تاریکە.
لە فیقه و فەلسەفە و لۆژیك و مێژوودا ئوستاد بوو، شایستەی خۆیەتی کە پێی بوترێت سەروەری گەورەی کوردستان.
هەرچەند لەبەرچاو ون بوو، بەڵام لە دڵ دەرناچێت و کوردستان پاش وەفاتی ئەو هەر هێندە ئەمەکناسی لە دەست دێت.

## موتاڵای حاشیەی زوڵفت لەسەر سەفحەی روخت سەعبە
## بەوەم چا بوو بە منداڵی لە دەرسی عیشق راهاتم

هەرچەندە هەر لە منداڵیەوە لە ناو دەسنووس و کەشکۆڵ و کتێبی لاپەڕە زەردی هەر سێ زمانی کوردی و فارسی و عەرەبیدا پەروەردە بووم و بەراوردکردنی ئەدەب و وێژەی ئەو سێ زمانە پێکەوە هەمیشە یەکێك لە حەزەکانم بووە و هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی تا ئەندازەیەك متمانە بە خۆم بکەم و پێشنیاری جەنابی «**عەبدولموئمین مەردۆخ**» لە ڕێگەی برای بەڕێز کاك «**یەحیا پەرتەوی**» بەڕێوەبەری بلاوگەی «**پرتەوبەیان**»ەوە پەسەند بکەم و خۆم بخەمە ناو دەریای بێ‌پەیی فەرهەنگە دەوڵەمەندەکەی «**زانای هەرەبلیمەت**[1] **جەنابی ئایەتوڵڵا شێخ موحەممەد مەردۆخی کوردستانی**»ەوە؛ بەڵام کاتێك تێگەیشتم چ چیایەکی سەرکەش و پڕ لە هەڵدێر و چ دەریایەکی بێ‌بن و پڕ لە گێژاوم گرتووەتە بەر کە تازە لە بنار و کەنار دوور کەوتبوومەوە و مەترسی گەڕانەوەش لە درێژەپێدان کەمتر نەبوو...

---

[1] ـ «زانای هەرە بلیمەت» وەسفێکە کە مامۆستا هەژاری رەحمەتی لە پێشەکی فەرهەنگی «هەنبانە بۆرینە»دا بۆ جەنابی ئایەتوڵڵای بەکار هێناوە.

هەر بۆیە بەوپەڕی دڵەڕاوکێوە پشتم بەو سەرچاوانەی لە بەر دەستمدا بوون بەست و بەو هیوایەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر لە کارەکەمدا ئەزموون پەیدا کەم؛ بەوپەڕی هێواشی و پەرێزەوە بەرەوپێش چووم و ئێستا کە ئەم پێشەکیە دەنووسم دوو ساڵی ڕەبەقە زۆربەی کاتی خۆمم بۆ ئەم کارە تەرخان کردووە و تازە خەریکم بەرگی یەکەمی ئەو فەرهەنگەی لە ماوەی هەژدە مانگدا نووسراوە[1] ئامادە دەکەم.

لەوانەیە خوێنەری بەڕێز گلەییم لێبکات و ڕەخنەم لێبگرێت و بڵێت: چی ناچاری کردبوویت بە تەنیا ڕووبەڕووی کارێك ببیتەوە کە پێویستە کۆمەڵێك پسپۆڕ پێکەوە پێوەی خەریك بن؟

منیش بەوپەڕی دڵنیاییەوە لەسەر ئەو باوەڕەم کە لێکۆڵینەوە و لەسەرنووسینی وەها شاکارێك هەرگیز بە هەوڵی تاکەکەسی بەو شێوەیەی کە شیاوە ناگاتە ئەنجام، بەڵام بەوپەڕی داخ و کەسەرەوە لەم بارە نائاساییەدا کە هیچ لایەن و ناوەندێك ئامادە نیە کەمترین پێداویستی ماددی و دراویی وەها پرۆژەیەك لە وەها ئاستێکدا دابین بکات؛ دەست لەسەر دەست دانان و چاوەڕوانی کردنی وەها هەل و دەرفەتێك خەیاڵێکی خاو و ئاواتێکی نەگونجاوە و ئەوەی هەمووی بە دەست نایەت نابێت دەست لە هەمووی هەڵبگیردرێت.

شتێکی تر کە مرۆڤ هان دەدات هەتا لەم ڕێگایەدا هەنگاوێکی هەرچەندە بچووك هەڵبگرێت ئەوەیە کە بە چاوی خۆمان دەبینین بەرهەمێکی وەها بەپێز تەنیا لەبەر دەسنووس بوون و نەگونجاو بوونی چاپەکەی، کەمترین ئاوڕی لێدراوەتەوە و کەمترین کەڵکی لێوەرگیراوە و هێشتا دەیان و سەدان وشەی تێدایە کە لەو فەرهەنگانەدا کە پاش بڵاوبوونەوەی فەرهەنگی مەردۆخ نووسراون بەرچاو ناکەون، هەروەها نووسەری بەڕێز لە پێشەکی فەرهەنگەکەیدا کورتەیەکی بەنرخی دەربارەی ڕێزمانی کوردی نووسیوە کە تا ئەو جێگایەی ئاگادارم لە هیچ کتێبێکی ڕێزماندا نەمدیوە نووسەرێك ئاماژەی پێبکات و وەکوو سەرچاوەیەك پشتی پێببەستێت.

لە کۆتاییدا جێگەی خۆیەتی بوترێت: ئەگەر ئەم هەوڵە کەموکورتە ڕێگە بۆ هەوڵێکی بە کۆمەڵ لە داهاتوودا بۆ ساغکردنەوە و لەسەرنووسینی ئەم فەرهەنگە خۆش نەکات؛ لانی کەم نابێتە بەربەست لە ڕێگەی وەها پرۆژەیەکدا.

هیوادارم کاردانەوەی خوێنەران بە گشتی و زانایان و پسپۆڕان بە تایبەتی لە بەرامبەر هەر جۆرە هەڵەیەکی ئەم پیاچوونەوە و لەسەرنووسینە و ڕاگەیاندنی بە بڵاوگەی «**پرتەوبەیان**»، هەرەوەزێك بۆ بژارکردنی هەڵەکانم ـ کە دەزانم کەم نین ـ بەدیبهێنێت.

---

[1] ـ ئایەتوڵڵا لە کۆتایی بەرگی دووەمی فەرهەنگەکەیدا نووسیویەتی: «مرۆڤ لە باروودۆخێکدا کە ئامرازی پێویست لە بەر دەستدا نیە و لە ماوەی هەژدە مانگدا ناتوانێت لەوە زیاتر سەرقاڵی کۆکردنەوەی وشەگەلی کوردی و هاوواتا فارسی و عەرەبیەکانی بێت...»

## تایبەتمەندیەکانی ئەم فەرهەنگە

❖ هەروەکوو ئاماژەی پێکرا نووسەری بەڕێز ئەم فەرهەنگەی لە ماوەی هەژدە مانگدا نووسیوە، کە بەڕاستی یەکێکە لە کارە سەرسووڕهێنەر و لە ئاسابەدەرەکانی ئایەتوڵڵای کارامە و بلیمەت.

❖ هەر لە ژیانی نووسەردا و لە ساڵی ١٣٣٢ی کۆچی هەتاوی (١٩٥٣ی زایینی)دا لە لایەن نووسەرەوە و بە خەتی خۆی ڕۆژانە ئامادەی چاپ کراوە و چاپخانەی ئەرتەش ئۆفسێتی کردووە و بڵاوی کردووەتەوە.

❖ لە بەهاری ساڵی١٣٦٢ی کۆچی هەتاوی (١٩٨٣ی زایینی)دا لە لایەن «چاپخانەی حەیدەری»ەوە ئۆفسێت کراوەتەوە و لە لایەن «بڵاوگەی غەریقی»ەوە لە سنە بڵاو کراوەتەوە.

❖ ئەم فەرهەنگە سێ زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی لە خۆ گرتووە و وشە کوردیەکان ـ کە بە زۆری شێوە ئاخاوتنی ناوچەی ئەردەڵانن ـ کراون بە وشەی سەرەکی و لە ژێریاندا هاوواتاگەلی فارسی و عەرەبیان بۆ نووسراوە و لەو ڕێگەیەوە نووسەر مانای وشە کوردیەکانی لێکداوەتەوە و هەموو لایەنە ماناییەکانی ئەو وشانەی شی کردووەتەوە. جگە لە مانای فارسی و عەرەبی، زۆر جار نووسەر هاوواتای کوردی وشە سەرەکیەکانیشی تۆمار کردووە.

❖ هەرچەندە نووسەر لە پێشەکی فارسی فەرهەنگەکەدا ئامانجی خۆیی لە نووسینی ئەم فەرهەنگە بە «وەرگرتنەوەی وشە تاڵانکراوە کوردی و فارسیەکان لە زمانی عەرەبی» لە قەڵەم داوە، بەڵام وا دەردەکەوێت ئەوە یەکێك لە ئامانجەکانی نووسینی ئەم فەرهەنگە بێت و سەرەکیترین ئامانجی نووسەر خزمەتکردنی زمانی کوردی و دەوڵەمەند کردنی و پاراستنی ئەو زمانە بە گشتی و شێوە ئاخاوتنی ئەردەڵانی بووە لە ڕۆژگارێکدا کە حکومەتی سەردەم بە تەواوی خۆی بۆ سڕینەوەی زمان و فەرهەنگ و وێژە و کەلتووری گەلانی دانیشتووی ئەم وڵاتە تەیار کردبوو و لە کۆتاییشدا هەر ئەو کەمتەرخەمی و پشتگوێخستنە هەرەسی پێهێنا و تاج و تەخت و بەختی سەرنگوون کرد.

هەر بۆیە نووسەر لە ڕێگەی زەقکردنی ئەو ئامانجەوە ڕێگەی بۆ بڵاوکردنەوەی فەرهەنگەکەی خۆش کردووە و بە هۆی ریزکردنی مانا و هاوواتای فارسی و عەرەبیەوە، جگە لەوەی پیتۆڵی و بلیمەت بوونی خۆیی لەو دوو زمانەشدا نیشان داوە, وشە کوردیەکانیشی بە تەواوی هەڵاجی کردووە و لایەنە لەیەکچوو و جیاوازەکانی ئەو وشانەی لە بواری ماناوە شی کردووەتەوە. هەتا خوێنەر بە وردی لە مانا فارسی و عەرەبیەکان و ڕوونکردنەوەکانی نووسەر ڕانەمێنێت؛ نازانێت چەندە لەو کارەدا سەرکەوتوو بووە.

❖ ئەگەر وشەیەکی کوردی چەند مانای جیاوازی فارسی و عەرەبی لە خۆ گرتبێت؛ چەند جار وشە کوردیەکەی نووسیوەتەوە و لە ژێریدا مانا فارسی و عەرەبیەکانی بە جیاجیا ریزکردووە، هەندێ جاریش هەر یەك جار وشە سەرەکیە کوردیەکەی نووسیوە و لە ژێریدا مانا جیاوازە فارسی و عەرەبیەکانی لە پاڵ یەکتردا ریزکردووە.

❖ نووسەر بۆ ئەوەی وشە هاوواتا و جیاوازەکان ـ کە لە پاڵ یەکتردا نووسراون ـ دیاری بکات، لە نێوان وشە هاوواتاکاندا نیشانەی «:»ەی داناوە کە لەم چاپەدا ئەم نیشانەیە کراوە بە «،»» و لە نێوان وشە جیاوازەکاندا نیشانەی «+»ەی داناوە، کە لەم چاپەدا ئەم نیشانەیە کراوە بە «.».

❖ هەر وشەیەك روونکردنەوەیەکی پێویست بووبێت بە زمانی فارسی روونکردنەوەکەی نووسیوە و ئەگەر نموونەیەیشی پێویست بووبێت بە هەر دوو زمانی کوردی و فارسی و هەندێ جار بە عەرەبیش نموونەی بۆ هێناوەتەوە.

❖ هەندێ جار نووسەر بۆ نووسینی مانای وشە کوردیەکان لە زمانی عەرەبیدا سوودی لە تایبەتمەندی وشەداتاشینی ئەم زمانە ـ کە لە رێزمانی عەرەبیدا روونکراوەتەوە ـ وەرگرتووە، بە تایبەت لە کاتی ماناکردنەوەی زاراوەگەلی کوردیدا بە عەرەبی پەنای بردووەتە بەر ئەم تایبەتمەندیەی زمانی عەرەبی.

❖ هەرچەندە وشەگەلی سەرەکی فەرهەنگەکە بە زۆری هی ناوچەی ئەردەڵانە، بەڵام نووسەر لە لێکدانەوەی وشەکاندا سوودی لە دیالێکت و شێوە ئاخاوتنی ناوچەکانی تری کوردستان وەرگرتووە و ئاماژەی پێکردوون، بە تایبەت دوو دیالێکتی گۆرانی و کرمانجی ژووروو.

❖ هەندێ جار نووسەر ئاماژەی بە زمانگەلی دیکەی وەك توركی و زمانە ئەورووپاییەکانیش کردووە، بە تایبەت کاتێك وشەیەکی ئەو زمانانە لە کوردیدا بەکار هێنرابێت یا وشەیەکی کوردی لەو زمانانەوە وەرگیرابێت. شایانی باسە ئەگەر وشەیەکی سەرەکی فەرهەنگەکە لە زمانە ئەورووپاییەکانەوە هاتبێتە ناو زمانی کوردیەوە، ئەو وشەیەی لە نێوان دوو سەرەرمدا (< - >) نووسیوە.

❖ تێکەڵاوبوونی زیاتری شاری سنە و دەوروبەری لەگەڵ زمان و فەرهەنگی فارسیدا لە چاو ناوچەکانی دیکەی کوردستان, کە بەشێکی بۆ گرنگبوونی شاری سنە و نزیکبوونی بنەماڵەی ئەردەڵانیەکان لە حکوومەتی ئەو سەردەمەی ئێرانەوە ـ کە هەندێ جار تا ئاستی ژن و ژنخوازی چووەتە پێش ـ دەگەڕێتەوە، هەروەها ئاوەڵەبوونی ئەو ناوچەیە بە رووی شارستانێتی سەردەمدا، زیاتر لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان، وای کردووە کە زمانی ئەم ناوچەیە هەمیشە لە ئاڵوگۆڕ و پێشکەوتندا بێت و خەڵکی ناوچە هاوواتای کوردی بۆ ئەو ئامراز و کەرەستە و ماشینە نوێیانەی کە

هاتووەتە شارەکەیانەوە دابنێن و هەندێ جاریش سەر و گوێلاکی وشە ناکوردیەکان بشکێنن و بیانکەنە هاوچەشنی وشە کوردیەکان.

جگە لەمەش هەروەکوو خوێنەران ئاگادارن شاری سنە و دەوروبەری و بە تایبەت مزگەوتی «دارولئیحسان» هەر لە دێرزەمانەوە بنکەیەکی گرنگی زانستە ئایینیەکان و مامۆستایانی ئایینی بووە و لەم رێگەوە زاراوەگەلی فیقھ و ئوسول و فەلسەفە و کەلام و ئەستێرەناسی و... لە ناو خەڵکیدا بڵاوبووەتەوە.

هەموو ئەمانە لە فەرهەنگەکەی ئایەتوڵڵادا رەنگی داوەتەوە و لەم فەرهەنگەدا هاوواتای زۆربەی ئەو وشە و زاراوەگەلە دەبینین و پێدەچێت ژمارەیەکی کەمی ئەو وشە هاوواتایانە نووسەر خۆی دایتاشیبن.

❖ هەروەکوو نووسەر لە پێشەکیەکەی خۆیدا ئاماژەی پێکردووە، هەموو وشەگەلی بەشی کوردی ئەم فەرهەنگە، کوردی پەتی نین، بەڵکوو هەموو ئەو وشە فارسی و عەرەبیانەشی لە خۆگرتووە کە لە زمانی کوردیدا بەکار دەهێنرێت. بۆ جیاکرنەوەی ئەم وشەگەلە, نووسەر ئەو وشە سەرەکیانەی کە لە عەرەبیەوە وەرگیراون خستووە ناو دوو کەوانەوە هەتا لەگەڵ وشە کوردیەکاندا تێکەڵ نەبێت ـ کە لەم چاپەدا ئەم وشەگەلە خەتیان بە ژێردا کێشراوە ـ، هەروەها ئەگەر لە ناو مانا کوردی و فارسیەکاندا وشەیەکی عەرەبی بەدیکردبێت، خەتی بەسەردا کێشاوە.

جگە لەمەش کارێکی زۆر گرنگ کە نووسەر ئەنجامی داوە ئەوەیە کە خەتی بەسەر هەموو وشە غەوارە و ناعەرەبیەکانی ناو وشە عەرەبیەکاندا کێشاوە کە بە زۆری لە زمانی فارسی و هەندێ جار لە زمانی کوردیەوە پەڕیونەتەوە ناو زمانی عەرەبی. کە هەموو ئەم جۆرە وشانە لەم چاپەدا خەتیان بەژێردا کێشراوە.

تەنانەت لە سەرەتای فەرهەنگەکەدا ویستوویەتی ئەو وشە فارسیانەش کە لە کوردیدا بەکار دەهێنرێت دیاری بکات و تا چەند لاپەڕەیەکیش ئەم کارەی کردووە و پاشان لێی پەشیمان بووەتەوە.

❖ هەروەکوو لە سەرەتای ئەم پێشەکیەدا ئاماژەی پێکرا، نووسەر پوختەیەکی سەبارەت بە رێزمانی کوردی و چۆنیەتی گۆڕانی پیتەکان، بەتایبەت کاتێك وشەکان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە دەپەڕنەوە، نووسیوە، کە زۆر گرنگە و جێگای لێکۆڵینەوەیە. جگە لەوەش لە سەرەتای بەرگی دووەمی فەرهەنگەکەدا بەشێکی بۆ پەندی پێشینان و درکە و ئیدیۆمگەلی کوردی تەرخان کردووە، کە لەم چاپەدا گوێزراوەتەوە بۆ سەرەتای فەرهەنگەکە پێش دەستپێکردنی پیتی ئەلف.

❖ هەندێ جار نووسەر هەر بە ماناکردنەوەی وشە و زاراوەوە نەوەستاوە و رستە و نیمچەڕستە و پەندی پێشینیان و ئیدیۆمیشی بە فارسی و عەرەبی ماناکردووەتەوە.

❖ نووسەر لە کۆتایی فەرهەنگەکەدا نووسیویەتی: «ئەگەر پێڕستێك بۆ وشە فارسیەکان و پێڕستێکی تر بۆ وشە عەرەبیەکانی ئەم فەرهەنگە دابنرێت، فارس و عەرەبیش سوود لەم فەرهەنگە وەردەگرن». کە بە داخەوە نەمانتوانیوە لەم چاپەدا ئەم ئارەزووەی نووسەر بهێنینە دی، چونکە جگە لەوەی کارێکی زۆر دژوارە؛ قەبارەی فەرهەنگەکە زیاد لە ئەندازە گەورە دەکات. هیوادارم ئەم ئارەزووەی نووسەر لانی کەم لە رێگەی گۆڕینی ئەم فەرهەنگەوە بە نەرمئامێر (*Software*) و دانانی تایبەتمەندی گەڕان (*Search*) بە هەر سێ زمانەکە تیایدا بەدی بێت.

❖ هەر لەبەر ئاسانکاری بۆ هاتنە دی ئەو ئاواتەی لە خاڵی پێشوودا ئاماژەی پێکرا؛ نووسەر هەندێ رستە و لێکدانەوە و نیمچەرستەی خستووەتە ریزی وشە سەرەکیەکانی فەرهەنگەکەوە کە لە زمانی کوردیدا وشە و زاراوەی تایبەتی بۆ دانەنراوە بەڵام لە زمانی فارسی یا عەرەبیدا وشە و زاراوەی تایبەتی هەیە. بۆ نموونە لە عەرەبیدا بۆ «دابەزینی پلە» وشەی «دَرَکَة» دانراوە، هەر بۆیە نووسەر لە ریزی وشە سەرەکیەکاندا «پلەکان حەوز»ی داناوە هەتا لە مانا عەرەبیەکەیدا ئاماژە بەو وشەیە بکات. هەروەها «پێسە بەرخ» و «پێسە ریوی» و «پێس هەنگوور» لە ریزی وشە سەرەکیەکانی فەرهەنگەکەدا هاتوون، چونکە لە فارسی و عەرەبیدا زاراوەیان بۆ دانراوە و...

هەروەکوو ئاماژەی پێکرا گرنگیی ئەو کارەی نووسەر رۆژێك دەردەکەوێت کە پێڕستێکی فارسی و عەرەبی بخرێتە پاڵ فەرهەنگەکە یا فەرهەنگەکە بکرێت بە نەرمئامێر، کە لە وەها کاتێکدا لەگەڵ دۆزینەوەی زاراوە فارسی یا عەرەبیەکەدا روونکردنەوە کوردیەکە بە هانامانەوە دێت.

❖ نووسەر لە هەڵبژاردنی وشە و هاوواتای فارسی و عەرەبیدا زۆر وردەکاری بەکارهێناوە و هەوڵی داوە بە پێی توانا لەبارترین و گونجاوترین وشە لە بەرامبەر وشە کوردیەکانەوە دانێت، واتە نووسەر لێکدانەوە کوردیەکانی وشە بە وشە نەکردووە بە فارسی و عەرەبی، کە نیشانەی زانایی و ئاگاداری نووسەرە لە دوو زمانی فارسی و عەرەبیدا سەرەڕای زمانی زکماکی خۆی.

❖ تایبەتمەندیەکی دیکەی ئەم فەرهەنگە لەوەدایە کە نووسەر چاوگە لێکدراو (دوویەشی)ەکانی وەکوو فەرهەنگەکانی دیکە تەنیا بەسەر یەکەوە مانا نەکردووەتەوە، بەڵکوو بەشی یەکەمیشی بە جیا مانا کردووەتەوە، بۆ نموونە لە چاوگی «فڕەدان»دا وشەی «فڕە»ی لە پێشدا مانا کردووەتەوە پاشان «فڕەدان»ی بەسەر یەکەوە مانا کردووەتەوە.

❖ نووسەر لە نووسین و ریزبەندی وشە کوردیەکاندا کەڵکی لە رێنووسی ئەمڕۆی کوردی وەرنەگرتووە, بەڵکوو پیتە کوردیەکانی لەگەڵ بزاوی عەرەبی (ـَـ ـِـ ـُـ)دا پێکەوە بەکار هێناوە و لە لایەکەوە سوودی لە پیتگەلی «ڤـ، ڵ، گ، ژ، پ»ی کوردی وەرگرتووە و لە لایەکی دیکەشەوە

پیتگەلی «ذ، ص، ض، ط، ظـ ث »ی عەرەبیشی بەکار هێناوە. هەروەها سوودی لە «ۆ ـ ێ»ی کوردیش وەرگرتووە, هەرچەندە زۆرجار نیشانەی «ˇ»ی بۆ دانەناون کە دانەنانی ئەم نیشانەیە هەندێ جار بۆ تایبەتمەندی شێوە ئاخاوتنی ئەردەڵانی دەگەڕێتەوە کە چۆنیەتی دەربڕینی «ۆ ـ ێ» لەم هەرێمەدا جیاوازە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان. هەروەها شایانی باسە کە نووسەر لە ریزبەندی وشە سەرەکیە کوردیەکاندا پیتی «ل»ی پێش پیتی «ڵ» داناوە و وەکوو دوو پیتی سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵدا کردوون و تێکەڵی نەکردوون کە ئەم وردەکاریەی نووسەر لەم چاپەشدا پارێزراوە.

❖ نووسەر لەباتی پیتی «$i$» لاتینی و «ی»ی کورت، نیشانەی «ـِ»ی داناوە و لەباتی بزوێنی «ە»ی کوردی لە ناوەڕاستی وشەدا، نیشانەی «ـَ»ی داناوە. هەروەها هەندێ جار «یٚ»ی کورتی بەکارهێناوە، بۆ بەراوردکردنی رێنووسی نووسەر لەگەڵ رێنووسی ئەمڕۆی کوردیدا، سەیری دوو لاپەڕەی نموونەی ئۆفسێتکراوی فەرهەنگەکە بکە، هەروەها سەرنجی ئەم خشتەیەی خوارەوە بدە!

| رێنووسی فەرهەنگەکە | رێنووسی ئەمرۆی کوردی | رێنووسی ئەم چاپەی فەرهەنگەکە |
|---|---|---|
| پِرچانِن | پرچانن | پرچانْن |
| پَنگەمُوس | پەنگەمووس | پەنگەمووس |
| تُرش | تورش | تورش |
| تِرَک پِا | ترەك پا | ترەکْ پا |
| چاوبُوق | چاوبۆق | چاوبۆق |
| خَط بُطلان | خەت بوتلاّن | خەت بوتلاّن |
| ثَبّات | سەببات | سەببات |
| جاذبەء زَوین | جازبەی زەوین | جازبەی زەوین |
| بی اَدِەبی | بیٚئەدەبی | بیٚئەدِەبی |
| رَوُز | ڕەوز | ڕەوْز |
| ذَرّە | زەڕە | زمڕە |
| رَشائی | ڕەشایی | رەشایی |
| زِنگ | زینگ | زینـْـگ |
| طُرفَةُ العَین | تورفەتولعەین | تورفەتولعەین |
| ظَفَر | زەفەر | زەفەر |
| صاف | ساف | ساف |

| رێنووسی فەرهەنگەکە | رێنووسی ئەمڕۆی کوردی | رێنووسی ئەم چاپەی فەرهەنگەکە |
|---|---|---|
| ضِدّ | زیدد | زیدد |
| وَلِیّ | وەلیی | وەلیی |
| یادآوَری | یاداوەری | یاداوەری |
| کَنِن | کەنن | کەنْن |
| مَظَنَّه | مەزەننە | مەزەننە |
| تُر | تور | تور |
| تورِّک | تووڕك | تووڕْك |
| توراغان | تۆراغان | تۆراغان |
| تۆرّ | تۆڕ | تۆڕ |
| سِه | سێ | سێ |
| فِ | ف | فْ |

هەروەکوو خوێنەری بەڕێز دەبینێت زۆرجار رێنووسەکەی نووسەر بۆ دەرخستنی چۆنیەتی دەربڕینی وشە کوردیەکان وردەکاری زۆرتری تێدایە, بۆ نموونە نیمچە بزوێنی «*i*» کە ئایەتوڵڵا بە «ـِ» ئاماژەی پێکردووە، بۆ رێنووسی فەرهەنگ زۆر پێویستە کە لە رێنووسی ئەمڕۆی کوردیدا نیە. هەربۆیە وشەی «کەنن» لە رێنووسی ئەمڕۆی کوردیدا دەکرێت بە «*Kenin*» بخوێنرێتەوە، کە چاوگە و بە مانای «کەندن»ە، یا بە «*Kenn*» بخوێنرێتەوە کە بە مانای «ئاودڕ»ە.

ئەم وردەکاریە لەم فەرهەنگەدا زۆر گرنگە، چونکە هەروەکوو دەزانن لە شێوە ئاخاوتنی ئەردەڵانیدا زۆرجار پیتی «د» لە چاوگدا بەدی ناکرێت، کاتێك رەگی وشەکە بە پیتی «ن» کۆتایی هاتبێت، وەك چاوگگەلی: «سەنن»، «خۆرانن» و...

هەروەها نووسەر بە دانانی نوختە لە ژێر پیتی «د»دا لە وشەگەلی «قادر» و «پاڵوودە» و «ئەدا» و...دا ئاماژەی بە دەرنەکەوتنی ئەم پیتە لەو وشەگەلەدا کردووە.

هەروەکوو خوێنەری بەڕێز لە خشتەکەدا دەیبینێت و پاشتریش ئاماژەی پێدەکەین، بە یارمەتی هاوکارانی بەڕێزی پیتچن هەوڵمان داوە لەم چاپەدا بەپێی توانا وردەکاریەکانی نووسەر لە رێنووسی فەرهەنگەکەدا بپارێزین.

❖ نووسەر لە پێشەکی فەرهەنگەکەدا گلەیی لە بەکارهێنانی ئەلفوبێی عەرەبی بۆ نووسینی کوردی و فارسی کردووە و بێتوانابوونی ئەو ئەلفوبێیەی بۆ دەرخستنی وردەکاریەکانی ئاخاوتنی زمانی فارسی و عەرەبی روونکردووەتەوە و تەنانەت پێشنیاری ئەلفوبێیەکی دیکەی

خستووەتە بەر باس کە جێگای سەرنجدان و لێکۆڵینەوەی پسپۆڕانی ڕێنووسی کوردیە.

شایانی باسە کە من خۆم لەگەڵ ئەوەدا نیم کە لە ڕێنووسدا هەموو وردەکاریەکانی ئاخاوتن دەقبەدەق ئاشکرا بکرێت و ئاسانکاری و ڕێکوپێکی و خێرانووسین بەسەر دانانی نیشانەگەلی زۆروبۆر بۆ گواستنەوەی دەقبەدەقی پیت و بزوێنەکان لە ئاخاوتنەوە بۆ نووسین هەڵدەبژێرم، تەنیا ئەوەندە هەیە کە لە نووسینی فەرهەنگدا نیازمان بە فۆنەتیکێکی ڕێکوپێك هەیە وەکوو لە زمانی ئینگلیزیدا دەیبینین.

❖ خاڵێکی تر کە لەم فەرهەنگەدا جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە نووسەر وشە و رستەگەلی فەرهەنگەکەی هەر بەو جۆرەی کە خەلکی بازاڕ و کووچە و کۆڵان لە ئاخاوتنی ڕۆژانەیاندا بەکاری دەهێنن گواستووەتەوە بۆ ناو فەرهەنگەکەی و هەرگیز لە هەوڵی ئەوەدا نەبووە بە لەفزی قەڵەم وشەکان بنووسێت و ئاخاوتنی زانایانە و خوێنەوارانەی سەردەمی خۆیی بەسەر ئاخاوتنی خەلکی رەمەکیدا هەڵنەبژاردووە.

❖ نووسەر جگە لە وشە کوردیەکان بەوپەڕی وردەکاریەوە سەر و بۆر و ژێر و زەنە و گیرەی بۆ وشە فارسی و عەرەبیەکانی ناو فەرهەنگەکەی داناوە.

❖ نووسەری بەرێز لە هەر جێیەکدا بە پێویستی زانیوە وێنە و شکلی پێویستی بۆ روونکردنەوەی زیاتری مانای وشەکانی فەرهەنگەکەی کێشاوە کە کارامەیی و دەسڕەنگینی نووسەر لە وێنەکێشانیشدا دەخاتە روو و وەکوو شاعیری عەرەب دەڵێت: «بەلای خوداوە هیچی تێناچێت کە هەموو مرۆڤەکان لە مرۆڤێکدا کۆبکاتەوە!».

❖ هەرچەندە شێوە ئاخاوتنی شیرینی ناوچەی ئەردەلان بەسەر فەرهەنگەکەدا زاڵە، بەلام وەسفکردنی ئەم فەرهەنگە بە فەرهەنگێکی لەسەداسەد ناوچەیی؛ بڕیارێکی دوور لە ئینساف و دادوەریە، چونکە جگە لەوەی ئەم فەرهەنگە دەیان و سەدان وشەی هەورامی و تەنانەت کرمانجی ژووروویشی لە خۆگرتووە؛ هەروەکوو مامۆستا جەمال نەبەز لە کتێبی «بەرەو زمانی یەکگرتووی کوردی»دا ئاماژەی پێدەکات ناوی زۆربەی ئامراز و ئامێرە سەرەتاییەکانی کشتوکاڵ و... لە نێوان زۆربەی دیالێکتە کوردیەکاندا هاوبەشە, هەروەها خوێنەری بەرێز پاش سەرنجدانی ئەم خشتەیەی خوارەوە و بەراورد کردنی هەندێ لەو روونکردنەوانەی کە لە پاڵ وشە کوردیەکانی فەرهەنگەکەدا نووسیومە؛ دەتوانێت بە ئاسانی مانای بەشێکی زۆری وشە سەرەکیەکانی ناو ئەم فەرهەنگە بدۆزێتەوە، هەرچەندە خۆی دانیشتووی ئەم ناوچەیەی کوردستان نەبێت:

| شێوە ئاخاوتنی ئەردەڵانی | شێوە ئاخاوتنی سلێمانی و دەوروبەری |
|---|---|
| مردگ | مردوو |
| شێویاگ | شێواو |
| پێکەییگ | پێکەییو، پێکەیشتوو |
| مانـگ | مانوو، ماندوو |
| بیانگ | بیانوو |
| تلەوکردن | تلکردنەوە |
| شلەوکردن | شلکردنەوە |
| کوتیاگ | کوتیاو، کوتراو |
| هارپیان | هارپدران |
| کەفتن | کەوتن |
| کێفسان | کوێستان |
| ناوێ | نابێ، نابێت |
| کولانن | کولاندن |
| خەفانن | خەواندن |
| پرتووکیاگ | پرتووکاو |
| دانیان | دانان |
| کوا | کەوا |
| کوانـگ | کوانوو |
| کەومرگ | کەوەر |
| مەژگ | مێشک |

❖ نووسەر لە فەرهەنگەکەیدا مانا کوردی و فارسی و عەرەبیەکانی پاش پیتگەلی «ك» و «ف» و «ع» بەم شێوەیەی خوارەوە ریزکردووە:

ك ـــ

ف ـــ

ع ـــ

بەڵام هەندێ جار نیشانەی پاش پیتی «ك»ی بەم شێوەیە داناوە:

ك +

هەرچەندە هۆی ئەم کارەم بە تەواوی بۆ ساغ نەکرایەوە، بەڵام وا دەزانم ئاماژە بێت بە مانایـەکی جیاوازی دیکەی وشە سەرەکیەکەی سەرەوە کە لە کوردیدا هاوواتای بۆ نەدۆزیوەتەوە، چونکە نووسەر لە پێشەکی فەرهەنگەکەدا نووسیویەتی: ئەم نیشانەیە «+» بۆ جیاوازبوونی مانا دانراوە.

بۆ دەرخستنی ئەم جیاوازیە لەم چاپەدا پاش پیتی «ك» کە نیشانەی زمانی کوردیە، سێ خاڵ دانراوە پاشان وشە کوردیەکە نووسراوە، بەم شێوەیە: ك:...

### چ سوودێك لەم فەرهەنگە وەردەگرین؟

جگە لە دۆزینەوەی مانای وشەکان کە کاری سەرەکی هەر فەرهەنگێکە، فەرهەنگی مەردۆخ لە زۆر رووی دیکەوە بۆ خوێنەران و لێکۆڵەران بەسوودە، کە چەند لایەکی دەخەینە روو:

- لە رووی ئەم فەرهەنگەوە دەتوانین شێوە ئاخاوتنی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە لە کوردستان بناسین و لەگەڵ شێوە ئاخاوتنی ئەمڕۆی هەمان ناوچەدا بەراوردی بکەین و رادەی ئەو ئاڵوگۆڕەی کە بە سەریدا هاتووە دیاری بکەین. هەروەها دەتوانین لەگەڵ شێوە ئاخاوتنی ناوچەکانی تری کوردستاندا بەراوردی بکەین.
- بە هۆی زۆربوونی وشە هاوواتاکان لەم فەرهەنگەدا، وشە و زاراوە هاوبەشەکانی ناو سێ زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی و شوێندانانی ئەم زمانگەلە لەسەر یەکتر باشتر روون دەبێتەوە.
- گەنجینەیەکی بەنرخە بۆ دۆزینەوەی وشە هاوواتاکان لە زمانی فارسی و عەرەبیدا، چونکە تەنانەت لە ئەمڕۆشدا فەرهەنگێکی فارسی یا عەرەبی کە وشە هاوواتاکانی لە پاڵ یەکدا ریز کردبێت ئێجگار کەمە. بۆیە ئەم فەرهەنگە لەم رووەوە بۆ خوێندکارانی بەشی فارسی و عەرەبی زۆر بەسوودە.
- زۆر بە وردی چۆنیەتی دەربڕینی شێوازی ئاخاوتنی وشەکانی دیاری کردووە، هەربۆیە هەوڵ دراوە بە پێی توانا ئەم وردەکاریانە بگوێزرێتەوە بۆ ناو ئەم چاپە تازە.
- سەرچاوەیەکی بەپێزە بۆ دۆزینەوەی ئەو وشە کوردی و فارسیانەی کە پەڕیونەتەوە بۆ ناو زمانی عەرەبی و بە پێچەوانەشەوە، چونکە نووسەر هەموو ئەو وشانەی دیاری کردووە.
- یاوەرێکی بەسوودە بۆ پسپۆڕانی بواری زاراوەسازی بەتایبەتی لەم هەلومەرجە تایبەتەدا کە ئەمڕۆ میللەتەکەمانی پێدا تێدەپەڕێت، کە شۆڕشی ئینفۆرماتیك و بەجیهانیبوون، لە لایەکەوە بەردەوامبوون و نەتوانەوەی زمانەکەمانی ـ لانی کەم بە قەد بڕکردنی زمانی گەلانی دراوسێمان ـ گەرەنتی کردووە و لە لایەکی دیکەشەوە گرنگی و پێویست بوونی داتاشینی زاراوەی نوێی زیاتر لە هەموو سەردەمێکی تر ئاشکرا کردووە.
- سەرچاوەیەکە بۆ دۆزینەوەی بارودۆخی ژیان و گوزەرانی دانیشتوانی ئەم هەرێمە لەو سەردەمەدا بە ژن و پیاو و منداڵ و هونەرمەند و قومارباز و...وە. چونکە نووسەر زۆر بە وردی

ناوی خواردنەکان و ئامێرەکانی مۆسیقا و داودەرمان و بەهاراتی نـاو چێـشت و ئـەو میوانـەی کـە وشك دەکرێن یا دەکرێن بە دۆشـاو و زاراوەکـانی قومـار و جـۆری یـاری و لەیـستۆکی منـداڵان و تەنانەت زاراوەکانی ناو ئەو یاریانە و گـەلێ وردەکـاری دیکـەی بـاس‌کـردووە کـە مێژوونووسـان و کۆمەڵناسان و ئەدیبان و... لە توێژینەوەکانیاندا دەربارەی ئەم هەرێمە لە کوردستان بـێ‌نیـاز نـابن لێی.

## من و ئـەم فەرهەنگە

هەرچەندە خەتی نووسەر زۆر خۆشە و هەرکەس تـا رادەیـەك شـارەزای کەشـکۆڵ و دەسنووسـی پێشینیان بێت پاش ماوەیەك لەگەڵیدا رادێت و دەتوانێت بە ئاسانی بیخوێنێتـەوە، بـەڵام بەداخـەوە فەرهەنگەکە ـ بە تایبەت چاپی دووەمی ـ باش ئۆفسێت نەکراوە و زۆرجار وشەکان دەرنەکەوتوون یـا زۆر کەمڕەنگن و ساغ کردنەوەیان کارێکی ئێجگار دژوارە و کاتێکی زۆر دەبات.

هەربۆیە پاش ئەوەی فەرهەنگەکە لە لایەن هاوکارانی «**بڵاوگەی پرتەوبـەیان**»ەوە پیتـچن کـرا و درایە دەستم ناچار بووم سـەرلەنوێ پێـشەکی فەرهەنگەکـە تـا سـەرەتای پـیتی ئـەلف بـە تـەواوی بنووسمەوە و لەوە بەدواوە بەشە پیتچن‌کراوەکان لەگەڵ فەرهەنگە ئۆفـسێت‌کراوەکـەدا کـە بـە خـەتی نووسەر نووسرابوو بەراورد بکەم و پاش ئەرك و ڕەنجێکـی زۆر و پەنابردنـە بـەر جێگەگـەلی دیکـەی فەرهەنگەکە کە وشە هاوماناکانی تێدا دووپات کرابووەوە و بە پشتبەستن بە فەرهەنگگەلی کـوردی و فارسی و عەرەبی، دەستم بە ساخ کردنەوەی فەرهەنگەکە کرد.

نووسەری بەڕێز زۆر جار لە پەراوێزی فەرهەنگەکەدا هەندێك وشـە و ڕوونکردنـەوەی خـستووەتە سەر فەرهەنگەکە کە بەداخەوە لە کاتی بەرگتێگرتن و ڕێکوپێك‌کردنی فەرهەنگەکەدا بە دەم تێغـی بەرگتێگرەوە ڕۆشتوون و بە زەحمەتێکی زۆر بەشی هەرەزۆری ئەو وشانەم ڕاست کردووەتەوە.

هەروەکوو ئاماژەی پێ‌کرا زۆر جار نووسەر نیـشانەی «ˇ»ی بـۆ وشـە کوردیـەکان دانـەناوە کـە دۆزینەوەی شێوەی دروستی دەربڕین و ڕێنووسی ئەو وشانەش کاتێکی زۆری بردووە.

هەروەها هەموو ئەو بزاوانەی کە نووسەر بۆ وشە عـەرەبی و فارسـیەکانی دانـاوە بـە یارمـەتی هاوکارانی بەڕێزی پیتچن گوێزراوەتەوە بۆ ئەم چاپە نوێیە.

بە پێشنیاری جەنابی «عەبدولموئمین» بڕیاردرا بۆ هەرکام لـە وشـەگەلی سـەرەکی فەرهەنگەکـە وشەیەکی هاوواتا یا ڕوونکردنەوەیەك بە دیالێکتی سۆرانی (شێوە ئاخاوتنی سلێمانی و دەوروبـەری) بخەمە سەر فەرهەنگەکە، کە پێشنیارێکی زۆر بەجێ و پێویست بوو، چـونکە لـە لایەکـەوە نووسـەر مانای هەندێك لە وشە سەرەکیەکانی فەرهەنگەکەی بە کوردی نەنووسیوە و لـە لایـەکی دیکەشـەوە

شـێوە ئاخـاوتنی ئـەردەڵانی بەسـەر فەرهەنگەکـەدا زاڵـە، جگـە لەمانـەش نووسـەر زۆربـەی ڕوونکردنەوەکانی خۆی سەبارەت بە وشە سەرەکیەکانی فەرهەنگەکە بە زمانی فارسـی نووسـیوە کـە وەرگێڕانی ئەو ڕوونکردنەوانە بۆ سەر زمانی کوردی کـارێکی زۆر پێویـست بـوو، تەنانـەت نووسـەر بەشێك لە سەرەتای فەرهەنگەکەی بە زمانی فارسی نووسیوە کـە ئـەو بەشەیـشم وەرگێڕاوەتـە سـەر زمانی کوردی.

دەتوانم بڵێم جاران ئەگەر خوێنەرێك لانی کەم زمانی فارسی نەزانیایە نەیدەتوانی سوودی تـەواو لەم فەرهەنگە وەربگرێت، بەڵام لەم چاپە نوێیەدا خوێنەر تەنیا بە زانینی زمانی کوردی و دیـالێکتی سۆرانی دەتوانێت سوود لەم فەرهەنگە وەربگرێت.

بێگومان خوێنەری بەڕێز دەزانێت کە دانانی وشەی هاوواتـا یـا ڕوونکردنـەوە بـۆ هـەموو وشـە سەرەکیەکانی ئەم فەرهەنگە چەندە کارێکی پشووسوارکەر و کاتگیرە، زۆر جار بـۆ ڕاسـتکردنـەوەی ڕێنووسی وشەیەك و ماناکردنەوەی، چەندین کاتژمێر کاتم تـەرخان کـردووە و ئـەم فەرهـەنگ و ئـەو فەرهەنگم کردووە.

هەندێ جار ئەگەر لە دیالێکتی سۆرانیدا وشەی هاوواتام دەست نەکەوتبێت، پەنام بردووەتە بـەر دیالێکتەکانی دیکە، یا لانیکەم ڕوونکردنەوەیەکم لەسـەر وشـەکە نووسـیوە و هەنـدێ جـاریش بـە وەرگێڕانی ڕوونکردنەوەکەی نووسەر لە فارسیەوە بۆ کوردی وازم‌هێنـاوە و ئەگـەر وشـە سـەرەکیەکە زیاتر لە مانایەکی هەڵگرتبێت ئاماژەم پێ‌کردووە، هەروەها ئەگەر هەستم کردبێت وشەکە نامۆیـە و ڕوونکردنەوەی پێویستە، وشە هاوواتاکەم ڕوونکردووەتەوە، جارجاریش هەندێ وشەم دەسـت کـەوتووە کە لە فەرهەنگە کوردیەکاندا ـ بە تایبەتی فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەی مامۆستا هـەژاردا ـ تۆمـار نەکراوە؛ کە ئەو وشانەشم لە فەرهەنگەکەدا گونجاندووە.

هەموو وشە و ڕوونکردنەوەکانی خۆمم لە ناو دوو قولاپدا ـ [...] ـ دانـاوە هـەتا لەگـەڵ دەقـی فەرهەنگەکەدا تێکەڵ نەبێت و هەر ڕوونکردنەوەیەکی نووسەریشم وەرگێڕابێتە سـەر زمـانی کـوردی لەناو دوو کەوانەدا و لە نێوان دوو قولاپدا ـ [(...)] ـ داناوە، هەتا خوێنەر بزانێت کە ئەم جۆرە وشە و ڕوونکردنەوانە، واتاکەی هی نووسەرە و داڕشتنەکەی لە منەوەیە.

شایانی باسە کە لە ماناکردنەوەی وشەکاندا هەوڵم داوە لە ڕووی مانا فارسی و عەرەبیەکانـەوە بۆچوونی نووسەر لە بارەی وشە سەرەکیەکانی فەرهەنگەکەوە بەدەستبهێنم و مانایەك هەڵبژێرم کـە لەو بۆچوونەوە نزیك بێت یا لەگەڵ بۆچوونی خۆیشمدا ناتەبا بێت.

هەروەها شـایانی باسـە کـە نووسـەری بـەڕێز زۆرجـار ڕوونکردنـەوەی فارسـی لـە ڕیـزی وشـە کوردیەکاندا نووسیوە، یا نموونەی کوردی لە ڕیزی وشە فارسـیەکاندا هێناوەتـەوە، کـە هـەموو ئـەو

ڕوونکردنەوە و نموونەگەلە جیا کراونەتەوە و گوێزراونەتەوە بۆ شوێنی تایبەتی خۆیان.

هەندێ جار بە پێی پێویست لە پەراوێزی فەرهەنگەکەدا هەندێ ڕوونکردنەوەم نووسیوە و لە کۆتاییدا نیشانەی (ر.ر)م پێ زیاد کردووە هەتا لەگەڵ پەراوێزەکانی نووسەردا تێکەڵ نەبێت.

هەروەکوو پێشتریش ئاماژەی پێ کرا بە یارمەتی هاوکارانی پیتچن هەوڵمان داوە بە پێی توانا بەشی هەرەزۆری وردەکاریەکانی نووسەر بگوێزینەوە بۆ ناو ئەم چاپە نوێیە؛ هەر بۆیە:

✓ ئەگەر وشەیەك لە فەرهەنگەکەدا خەتی بە ژێردا کێشرابوو ئەوە وشەیەکی ڕەسەن نیە و لە زمانێکی دیکەوە وەرگیراوە.

✓ هەرکام لە وشە سەرەکیەکانی فەرهەنگەکە خەتی بە ژێردا کێشرابوو ئەوە لە عەرەبیەوە وەرگیراوە و ئەگەر لە نێوان دوو سەرەڕمدا نووسرابوو ـ <...> ـ سەر بە زمانە ئەورووپاییەکانە.

✓ ئەگەر لە نێوان دوو وشەدا نیشانەی «،» دانرابوو ئەو دوو وشەیە پێکەوە هاوواتان و ئەگەر نیشانەی «.» دانرابوو مانایان لە یەك جیاوازە. شایانی باسە منیش لە ڕوونکردنەوەکانی خۆمدا سوودم لەم دوو نیشانەیە وەرگرتووە.

✓ ئەگەر وشەیەك نیشانەی زەنە (ـْ)ی بە سەرەوە بوو ئەوە نیمچە بزاوی «i»ی لەگەڵدایە و پێویستە لە کاتی خوێندنەوەدا تۆزێك زمانی بۆ دابگیردرێت. شایانی باسە ئەم نیشانە تەنیا بۆ ئەو وشانە دانراوە کە لەوانەیە بە هۆی نامۆبوونەوە خوێنەر لە دەربڕینی وشەکەدا تووشی هەڵە بکات.

✓ ئەگەر پیتی «د» لە ناو وشە سەرەکیەکانی فەرهەنگەکەدا بەم شێوەیە نووسرابوو: «ڍ»، ئەوە پێویستە وەکوو پیتی «د» لە وشەی «قادر» و «نادر»دا بخوێنرێتەوە، کە لە «قایر» و «نایر»ەوە نزیکترە هەتا قادر و نادر.

هەر چەندە نووسەر نیشانەی «ـِ»ی لە هەر جێگایەکدا پێویست بووبێت بۆ هەموو ئەو پیتە کوردیانە داناوە کە نیمچە بزوێنی «i»یان لەگەڵدایە، بەڵام لەبەر ئەوەی نیشانەی نامۆ لە ڕێنووسی فەرهەنگەکەدا لەرادەبەدەر نەبێت و هەروەها بە هۆی گیروگرفتی فۆنتی وشە کوردیەکانەوە, هەروەکوو ئاماژەی پێکرا, نیشانەی زەنە (ـْ) ـ کە لەم چاپەدا جێنشینی نیشانەی «ـِ»یە ـ تەنیا بە پێی پێویست دانراوە.

هەر لەبەر ئەو دوو هۆیەی سەرەوە نوختەی ژێر پیتی «د»یش تەنیا لە وشە سەرەکیەکانی فەرهەنگەکەدا دانرا.

بۆ ئەوەی لە خۆمەوە دەسکاری فەرهەنگەکەم نەکردبێت، لە هەر جێگایەکدا نووسەر نوختەی ژێر پیتی «د»ی دانەنابێت؛ منیش خۆم لە دانانی پاراستووە هەرچەندە وام هەست کردبێت کە نووسەر دانانی ئەو نوختەیەی لە بیر چووبێت.

پێویسته بوترێت که نوختەی ژێر پیتی «د» له پێشەکیەکانی نووسەردا به تەواوی دانراوه.

شایانی باسه که له لایەن هاوکارانی پیتچنەوه هەموو وێنەکانی ناو فەرهەنگەکه ئیسکەن (*Scan*) کراوه و گوێزراوەتەوه بۆ کۆتایی پیتەکان هەتا لەگەڵ فەرهەنگەکەدا تێکەڵ نەبێت، هەربۆیه:

- ○ ئەگەر له کۆتایی وشەیەکدا نووسرا بوو «وێنه»، ئەو وشەیه له کۆتایی هەمان پیتدا وێنەیەکی تایبەتی هەیه.
- ○ ئەگەر له کۆتایی وشەیەکدا نووسرا بوو «وێنه←...»، ئەوه وێنەی تایبەتی ئەو وشەیه له کۆتایی پیتی سەرەتای وشەی پاش تیر(←)ەکەدایه.
- ○ ئەگەر له کۆتایی وشەیەکدا نووسرا بوو «وێنەی هەیه.»، ئەوه نووسەری بەڕێز ئاماژەی بەوه کردووه که ئەو وشەیه له جێگایەکی فەرهەنگەکەدا وێنەیەکی تایبەتی هەیه، بەڵام جێگەی وێنەکەی دیاری نەکردووه و منیش پاش گەڕان بە وشە هاوواتاکاندا وێنەکەم بۆ نەدۆزراوەتەوه.

به هۆی گۆڕینی وشه سەرەکیەکانی فەرهەنگەکەوه بۆ ڕێنووسی ئەمڕۆی کوردی، ئەو وشانەی له چاپی پێشووی فەرهەنگەکەدا به پیتگەلی «ث» و «ص» دەستپێدەکەن گوێزراونەتەوه بۆ ناو پیتی «س» و پیتگەلی «ذ» و «ظ» و «ض» گوێزراوەتەوه بۆ ناو پیتی «ز» و پیتی «ط» گوێزراوەتەوه بۆ ناو پیتی «ت».

له کۆتاییدا به هۆی گیروگرفتی فۆنتی وشه کوردیەکانەوه له بەرنامەی «*Word*»دا؛ دانەدانەی وشه سەرەکیەکانی فەرهەنگەکەمان سەرلەنوێ به پێی ئەلفوبێی ئەمڕۆی کوردی ڕیزبەندی کردوەتەوه و هاوکارانی بەڕێزی پیتچن بەو پێیه سەرلەنوێ فەرهەنگەکەیان داڕشتووەتەوه.

ئێستا که ئەم وشانه دەنووسم له سەر شانۆی خەیاڵمدا چاوم لێیه که ئایەتوڵڵای بەساڵاچوو و ریش‌سپی له باتی پشوودان و گەشتوگوزار و دانیشتن له دیوەخاندا؛ له سووچی ژوورێکدا به تەنیا دانیشتووه و به دەسته لەرزۆکەکانی پاش ڕێکوپێك‌کردنی کاغەزەکانی بەر دەستی و خەت کێشان تیایدا، پیت به پیت و وشه به وشه و دێڕ به دێڕ و لاپەڕه به لاپەڕه خەریکی پاکنووس کردنی فەرهەنگەکەیەتی و جاربەجار وشەیەکی تازەی بیر دەکەوێتەوه و له پەراوێزدا تۆماری دەکات و هەندێ جار له ژێر وشەیەکدا وێنەی تایبەت بەو وشەیه دەکێشێت و جاربەجاریش بە لاپەڕه پاکنووس‌کراوەکاندا دەگەڕێت بۆ ئەوەی وێنەیەکی تایبەت بەم وشەیەی که ئێستا خەریکه دەینووسێتەوه له جێگایەکی تری فەرهەنگەکەیدا بدۆزێتەوه و ئاماژەی پێبکات. هەندێ جار

لاپەڕەیەك خەریکە تەواو دەبێت و لە ناکاو مەرەکەفەکە دەتکێتە سەر لاپەڕەکە، یا وێنەکەی بە دڵ نیە و ناچارە سەر لە نوێ ئەو لاپەڕەیە بنووسێتەوە و هەندێ جاریش لاپەڕە ئۆفسێتکراوەکانی بۆ دەهێننەوە، چاوێکی پێدا دەخشێنێت و چاپەکەی بە دڵ نیە و سەر لە نوێ ئەو لاپەڕەیە پاکنووس دەکاتەوە. پاش تەواوبوونی کارەکە و چاپکرانی فەرهەنگەکە لەوپەڕی خۆشحاڵیدایە کە دەرفەتی پێویست بۆ بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکەی ڕەخساوە و لاپەڕەکانی فەرهەنگەکەی هەڵدەداتەوە و دەبینێت لە هەندێ جێگادا وشەکان کەمڕەنگن و لە هەندێ جێگادا وێنەکان ڕەش بوونەتەوە و وردەکاریەکانی فەوتاوە و لە هەندێ لاپەڕەدا پەراوێزەکان قرتاون، هەناسەیەکی سارد هەڵدەکێشێت و دەستێك بە ریشە چەرمووەکەیدا دێنێت و سەرنجی دەبڕێتە دیوارەکەی بەرامبەری و دەچێتە ناو دەریای بێ‌بنی ئەندێشە و خەیاڵەوە...

هیوادارم منیش بەم هەوڵە کەموکورتەم ڕەنج و زەحمەتەکانی ئەو زانا کوردپەروەرەم بە فیڕۆ نەدابێت و گیانی پیرۆزی ئایەتوڵڵام لە خۆم زویر نەکردبێت.

### ئەو سەرچاوانەی پشتم پێ بەستوون

✎ «**فەرهەنگی مەردۆخ**»: لە هەر جێگایەکدا وشەیەکم بۆ نەخوێنرابێتەوە یا لە ڕێنووسەکەی دوودڵ بووبم پێش هەموو شتێك پەنام بردووەتە بەر وشە هاوواتاکانی فەرهەنگەکە.

✎ «**فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەی مامۆستا هەژار**»: زۆربەی کات بۆ زیادکردنی وشە و ڕوونکردنەوە پشتم پێ‌بەستووە و تەنانەت زۆر جار ڕوونکردنەوەکانی مامۆستا هەژارم دەق بە دەق گواستووەتەوە.

✎ «**فەرهەنگی شیرینی مامۆستا فازڵ نیزامەدین**»: کە هەم بۆ دۆزینەوەی وشەی هاوواتا و هەم بۆ دۆزینەوەی مانای زاراوەکان لە کوردیدا پشتم پێ بەستووە.

✎ «**فەرهەنگی دیهخودا**»: بە شێوەی نەرمئامێر (*Software*) کە بۆ ڕوونکردنەوەی وشە سەرەکیەکان و دڵنیابوون لە ڕێنووسی وشە فارسیەکان پشتم پێ بەستووە.

✎ «**فەرهەنگی ئەلمونجیدی پاپ لویس**»: کە بۆ دڵنیابوون لە ڕێنووسی وشە عەرەبییەکان و هەندێ جار بۆ ڕوونکردنەوە کوردیەکان پشتم پێ بەستووە.

✎ «**فەرهەنگی زانیاری وێنەداری مامۆستا کەمال جەلال غەریب**»: کە بۆ ماناکردنەوەی ناوی گژوگیا و ئاژەڵ و باڵندە و مێروو و... پشتم پێ بەستووە.

✎ «**فەرهەنگی عەمید**»: کە بۆ ڕوونکردنەوەی وشە سەرەکیەکان و دڵنیابوون لە ڕێنووسی وشە فارسیەکان پشتم پێ بەستووە.

ئەمە ئەو سەرچاوانە بوو کە زۆرترین سوودم لێوەرگرتوون، بەڵام کاتێک مانای دروستی وشەیەکم لێ عاسی بووبێت، پەنام بردووەتە بەر هەموو جۆرە فەرهەنگ و فەرهەنگۆکێك و رووم لە هەموو ناسراو و دۆست و ئاشنایەك ناوە.

ئەمەش ناوی ژمارەیەك لەو فەرهەنگانەیە:

- فەرهەنگی زاراوەی مامۆستا بەدران ئەحمەد حەبیب.
- فەرهەنگی نۆبەرەی مامۆستا گیوی موکریانی.
- فەرهەنگی «فرهنگ اصطلاحات معاصر» عەرەبی فارسی، نووسینی نەجەفعەلی میرزایی.
- «کتاب التعریفات»، نووسینی سەیید شەریفی گورگانی.
- فەرهەنگی گیرفانی خاك، نووسینی مامۆستا مەحموود عەبدوڵڵا و مامۆستا جەمال جەلال.
- فەرهەنگی زانیاری مامۆستا کەمال جەلال غەریب.

لە کۆتاییدا پێویستە سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە بکەم کە لەم رێگایەدا هانیان داوم یا بە هەر جۆرێك یارمەتیان داوم بە تایبەت هاوسەری ئازیزم «بەدری بەهرامی» کە جگە لە هاندان و رەخساندنی بارودۆخی گونجاو، بۆ ماناکردنەوە و چۆنیەتی دەربڕینی شێوازی ئاخاوتنی بەشێکی زۆر لە وشەکانی فەرهەنگەکە بە هانامەوە هاتووە.

**رەئووف رەهنموون**

**خوێندکاری دوکتۆرای زانستە ئایینیەکانی زانکۆی تاران**

**٢٥ی رەزبەری ١٣٨٥ی کۆچی مانگی ٢٠٠٦/١٠/١٧ی زایینی**

## مقدمه‌ی فارسی

### الف) ویژگی‌های این فرهنگ لغت

ﷲ همان‌گونه که مؤلف فرزانه و بزرگوار در پایان جلد دوم نوشته است؛ این اثر در مدت هیجده ماه به رشته‌ی تحریر درآمده است.

ﷲ در سال ۱۳۳۲ هـ‌ش روزانه از طرف مؤلف بازنویسی شده و توسط «**چاپخانه‌ی ارتش**» افست و منتشر گردیده است.

ﷲ در بهار سال ۱۳۶۲هـ‌ش توسط «**چاپخانه‌ی حیدری**» دوباره افست شده و از طرف «**انتشارات غریقی**» در سنندج منتشر گردیده است.

ﷲ این فرهنگ لغت شامل سه زبان کردی، فارسی و عربی است که بیشتر لغات مدخل آن به لهجه‌ی اردلانی است که شاخه‌ای از گویش سورانی ـ یکی از گویش‌های اصلی زبان کردی ـ است.

- مؤلف علاوه بر معادل‌های فارسی و عربی؛ مترادف کردی اکثر لغات مدخل را نیز به اثر خود افزوده است.

- از طریق معادل‌های فارسی و عربی و لغات مترادف این دو زبان؛ مؤلف وجوه معنایی لغات مدخل را به طور کامل روشن ساخته است و هرجا نیاز به توضیح احساس شده باشد آن را به زبان فارسی توضیح داده و گاه علاوه بر زبان فارسی؛ به زبان‌های عربی و کردی نیز مثال و توضیح لازم را برای لغات مدخل ذکر کرده است.

- اگر یکی از لغات مدخل دارای چند معنی متفاوت بوده باشد؛ معمولاً چند بار آن لغت را نوشته و در ذیل آن، مترادف فارسی و عربی آن را آورده است، گاه نیز به یک بار نوشتن لغت مدخل اکتفا نموده و در ذیل آن معانی متفاوت فارسی و عربی آن را در کنار هم ذکر کرده است، که در چنین مواردی برای جدا کردن لغات مترادف از لغات متباین؛ در میان لغات مترادف علامت «:» را قرار داده است که این علامت در این چاپ به علامت «،» تغییر داده شده است و در وسط لغات متباین علامت «+» را قرار داده است که این علامت نیز به «.» تغییر یافته است.

- مؤلف در معنی کردن لغات مدخل بـه عربی ـ به ویژه در ترجمه‌ی اصطلاحات ـ گاه از ویژگی اشتقاق لغات در این زبان سود جسته است.

- هرچند بیشتر لغات مدخل این فرهنگ لغت مربوط به لهجه‌ی اردلانی است اما مؤلف در میان آن‌ها و در معانی کردی آن‌ها لغات مربوط به دیگر لهجه‌ها و گویش‌های زبان کردی را نیز ذکر کرده است.

- اگر لغت مدخل در زبان کردی اصیل نباشد و از زبان عربی وارد زبان کردی شده باشد، آن را در پرانتز قرار داده است، که در این چاپ در زیر چنین لغاتی خط کشیده شده است. ضمناً در دیگر کلمات کردی، فارسی و عربی اثرش نیز لغات غیر اصیل را مشخص کرده است.

- مؤلف محترم گاه به زبان‌های دیگر مانند ترکی و زبان‌های اروپایی نیز اشاره کرده است و اگر لغت مدخل برگرفته از این زبان‌ها بوده باشد آن را در میان علامت «<...>» نوشته است.

- نویسنده در بازنویسی و ترتیب‌بندی لغات کردی اثرش از رسم‌الخط رایج کردی استفاده نکرده است، بلکه در کنار استفاده از حروف ویژه‌ی زبان کردی، از صداهای «ـَـِـُـ» نیز استفاده نموده و سعی کرده است در حد توان صدای مخصوص همه‌ی حروف کردی را از قلم

نیندازد، علاوه بر این همه‌ی لغات فارسی و عربی را اعراب‌گذاری کرده است.

ꕥ مؤلف در مقدمه‌ی این اثر خلاصه‌ای در مورد قواعد زبان کردی ـ اعم از صرف و نحو ـ به زبان کردی نگاشته، علاوه بر آن قسمتی را به ضرب‌المثل‌ها و کنایات کردی اختصاص داده است. همچنین رسم الخط عربی را برای نگارش زبان فارسی و کردی مناسب ندانسته و رسم الخطی را اختراع و به عنوان جایگزین پیشنهاد کرده است.

ꕥ مؤلف در پایان جلد دوم نوشته است: «**هرگاه فهرستی برای لغات فارسی و فهرست دیگر برای لغات عربی تنظیم شود فارس و عرب هم از این کتاب استفاده خواهند کرد.**» که متأسفانه برآورده کردن این خواسته‌ی ایشان در این چاپ میسّر نشد، زیرا این امر موجب چند برابر شدن حجم کتاب می‌شد، امیدواریم در آینده این اثر به صورت نرم‌افزار در اختیار علاقه‌مندان قرار گیرد و از این طریق آرزوی مؤلف جامه‌ی عمل بپوشد.

ꕥ به خاطر زمینه‌سازی برای برآورده شدن خواسته‌ای که در قسمت قبل به آن اشاره شد؛ مؤلف علاوه‌بر لغات و اصطلاحات، گاه در مدخل لغات کردی اثر خود، عبارات و شبه‌جمله‌های کردی را نیز ذکر کرده است، تا به لغت خاصی که در زبان فارسی یا عربی برای این عبارات و شبه‌جمله‌ها وضع شده است اشاره کند.

ꕥ مؤلف در ترجمه‌ی لغات مدخل کوشیده است دقیق‌ترین و مناسب‌ترین معادل فارسی و عربی را برای لغات مدخل کردی بیابد، که این امر نشان از تبحر ایشان در این دو زبان علاوه بر زبان مادریشان دارد. همچنین در ترجمه‌ی لغات مدخل فقط به ذکر یک لغت فارسی و عربی اکتفا نکرده است؛ بلکه همه‌ی لغات مترادف عربی و فارسی را ـ که به نوعی یکی از وجوه معنایی لغات مدخل را در برگفته باشند ـ ذکر کرده است.

ꕥ مؤلف در هر جایی از اثرش که لازم دانسته است شکل و نقاشی لازم را برای توضیح لغات مدخل کشیده است که این امر نیز نشان از استعدادهای بی‌شمار ایشان دارد.

### ب) از این اثر چه بهره‌ای می‌بریم؟

علاوه بر یافتن مفهوم لغات مدخل که وظیفه‌ی اصلی هر فرهنگ لغتی است؛ «**فرهنگ مردوخ**» دارای ویژگی‌های منحصر به فردی است که جنبه‌هایی از آن به شرح زیر است:

➤ از طریق این فرهنگ لغت می‌توانیم با لهجه‌ی ساکنین این منطقه در زمان حیات مؤلف

آشنا شویم و آن را با لهجه‌ی امروزی همین منطقه و دیگر مناطق کردستان مقایسه کنیم.

- لغات اصیل و دخیل هر یک از سه زبان کردی، فارسی و عربی را مشخص سازیم.
- منبع ارزشمندی است برای یافتن لغات مترادف در هر سه زبان، زیرا مؤلف در حد توان همه‌ی لغات مترادف را ذکر کرده است.
- مرجع مهمی است برای متخصصین فن معادل‌سازی در زبان کردی زیرا مؤلف معادل کردی بسیاری از اصطلاحات فارسی و عربی و حتی انگلیسی را در فرهنگ لغت خود ذکر کرده است.
- آینه‌ی تمام‌نمایی است برای مشاهده‌ی وضعیت زندگی ساکنان این منطقه از کردستان اعم زنان، مردان، کودکان، هنرمندان، ورق‌بازان، ورزش‌کاران و... زیرا مؤلف در نهایت دقت و موشکافی اسم غذاها و چاشنی‌ها و ادوات موسیقی و اصطلاحات ورق‌بازی و انواع بازی کودکان و حتی اصطلاحات رایج در آن و نام انواع اسباب‌بازی‌های کودکان و... را ذکر کرده است؛ که مورخان، جامعه‌شناسان، محققان و... در پژوهش‌هایشان در مورد این خطه از آن بی‌نیاز نخواهند بود.

### ج) ویژگی‌های چاپ جدید

چاپ‌های قبلی این اثر در واقع افست دست‌خط مؤلف بود که با رسم‌الخط رایج زمان خود آن را به رشته‌ی تحریر درآورده بود.

هرچند رسم‌الخط مؤلف برای کسی که تا اندازه‌ای دست‌نوشته‌های گذشتگان را مطالعه کرده باشد بسیار واضح و خوانا است و پس از مدتی خواندن آن آسان می‌نماید؛ اما متأسفانه گاه کم‌رنگ بودن و مخدوش بودن چاپ آن مانع از خواندن درست لغات می‌شود و گاه لغاتی را که مؤلف در حاشیه‌ی اثر افزوده است در هنگام صحافی مخدوش شده است.

بنابراین سعی شده است قبل از هر چیز این اثر به صورت دقیق ویراستاری و لغات و توضیحات کردی آن بر اساس رسم‌الخط امروز زبان کردی بازنویسی و لغات مخدوش آن به کمک دیگر لغات مترادف خود این اثر و در مراحل بعدی با کمک گرفتن از فرهنگ‌لغت‌های کردی، فارسی و عربی بازیابی شود، سپس لغات مدخل براساس رسم‌الخط امروز زبان کردی

مرتب شود.

همچنین برای استفاده‌ی هرچه بیشتر خوانندگان کردزبان و به پیشنهاد جناب آقای «عبدالمؤمن مردوخ» سعی شده است معادل سورانی مدخل‌های کردی، با توجه به گویش استانداردی که زبان نوشتاری بیشتر ساکنین کردزبان دو کشور ایران و عراق است، به این اثر افزوده شود و توضیحات فارسی مؤلف به طور کامل به زبان کردی ترجمه شود.

**شایان ذکر است که در افزودن معادل‌های کردی در حد توان تلاش شده است با توجه به معانی فارسی و عربی لغات مدخل؛ دیدگاه مؤلف را در مورد این لغات تشخیص داده و آن را در قالب لغات متناسب با آن قرار دهم، هرچند متناسب با دیدگاه این‌جانب نباشد.**

ضمناً با کمک همکاران محترم حروف‌چین انتشارات «پرتو بیان» سعی شده است قسمت اعظم موشکافی‌ها و علائم موجود در رسم الخط مؤلف به این چاپ منتقل شود.

گفتنی است که مجموع این تلاش‌ها بیش از سه سال کار مداوم را به خود اختصاص داده است، امید است که مقبول نظر خوانندگان محترم به‌ویژه اهالی اندیشه و فرهنگ باشد.

**بنابر آنچه گذشت ذکر این توضیحات ضروری می‌نماید:**

✓ در هر جای این فرهنگ لغت، عبارت یا لغتی در میان کروشه «[ ]» مشاهده شود مربوط به ویراستار است نه مؤلف، اما اگر عبارت ویراستار ترجمه‌ی عبارت مؤلف باشد، آن را در میان پرانتز و پرانتز را در میان کروشه قرار داده است «[...(...)]»، بنابراین هرگاه خواننده‌ی محترم با چنین عباراتی مواجه شد می‌فهمد که مفهوم آن مربوط به مؤلف و ترجمه‌ی آن مربوط به ویراستار است.

✓ اگر زیر لغات مدخل خط کشیده شده بود به معنای آن است که چنین لغاتی بنا به دیدگاه مؤلف اصیل نیستند و از زبان عربی به زبان کردی رخنه کرده‌اند.

✓ علامت «.» در میان لغات این فرهنگ لغت به معنای تفاوت لغات از لحاظ معنی، و علامت «،» به معنای مترادف بودن لغات است.

✓ اگر لغت مدخل در بین این علامت «<...>» نوشته شده بود به معنای آن است که لغت

مذکور از زبان‌های اروپایی وارد زبان کردی شده است.

✓ اگر زیر هر لغتی در این فرهنگ لغت ـ اعم از کردی، فارسی و عربی ـ خط کشیده شده بود؛ به معنای دخیل بودن آن لغت در زبان مذکور است.

✓ اگر بر روی حروف لغات کردی علامت «ـ̊» قرار داشت به معنای وجود کسره‌ای کوتاه پس از آن حرف است. که این صوت در رسم‌الخط لاتین با حرف «*i*» نشان داده می‌شود.

✓ وجود نقطه در زیر حرف دال در لغات مدخل این فرهنگ لغت بدین معنی است که حرف دال کاملاً تلفظ نمی‌شود و تلفظ آن به حرف «ی» نزدیکتر است تا دال.

✓ اگر در پایان لغتی با کلمه‌ی «وێنه» مواجه شدید به معنای وجود شکل مربوط به آن لغت در پایان همان حرف است.

✓ اما اگر با کلمه‌ی «وێنه←...» مواجه شدید به معنای وجود شکل مربوط به آن لغت در پایان حرف آغازین لغت پس از علامت «←» است.

✓ عبارت «وێنه‌ی هه‌یه.» به معنای آن است که لغت مذکور در این فرهنگ لغت دارای شکل خاص خود می‌باشد، اما متأسفانه مؤلف مکان آن را مشخص نکرده است و ویراستار پس از جستجوی لغات مترادف؛ آن شکل را نیافته است.

در پایان گفتنی است که چون مقدمه‌ی مؤلف به زبان فارسی است و توضیحات ایشان در مورد لغات مدخل نیز غالباً به همین زبان است؛ انتظار می‌رود خوانندگان محترم فارسی زبان به آسانی بتوانند از این فرهنگ لغت استفاده نمایند.

## ملاحظات للقاریء العربي المحترم

کتب المؤلف الفاضل الشهیر «**آیةالله الشیخ محمد مردوخ کردستاني**» هذا المعجم القیم خلال ثمانیة عشر شهراً، مما یدل علی نبوغه في اللغات الکردیة و الفارسیة و العربیة.

اعدّ المؤلف نفسهُ هذا المعجم للطبع و طُبِعَ بخط المؤلف في «مطبعة ارتش» سنة ۱۹۵۳و اعید طبعه في مطبعة «حیدري» سنة ۱۹۸۳میلادیة .

بما أنَّ اللغة التي رتّب المؤلّف الفاضل معجمه علی اساسها هي في الغالب اللهجة السورانیة لساکني مدینة سنندج و نواحیها، و بما أنَّ تعلیقات المؤلّف علی اللغات قد کُتِبَت باللغة الفارسیة؛ قام المحقق بإدراج اللهجة السورانیة لساکني مدینة السلیمانیة و نواحیها ــ اي اللهجة الرسمیة التي یستعملها الکتّاب و الأُدباء في کردستانَي العراق و ایران ــ في هذا المعجم و بترجمة تعلیقات المؤلف إلی اللغة الکردیة حتی یسهل علی القاریٔ الکردي الاستفادة منه.

و بما أنَّ المعجم یحتوي علی رموز و اصطلاحات خاصّة، نسترعي إنتباه القاریٔ العربي الکریم الی ما یلي:

♥ اللغات و العبارات المكتوبة بين مَعقوفتين «[ ]» مدرجة من المحقق، لكن إذا كانت مكتوبة بين قوسين داخلَ العلامة المذكورة بهذة الصورة «[(...)]»؛ فإنَّ مفهوم العبارة من المؤلّف ــ كتبها باللغتين الفارسية و العربية ــ و قام المحقق بترجمتها الى اللغة الكردية.

♥ علامة «،» بين لغات هذا المعجم ـ بما فيها اللغات العربية ـ يدل على ترادف اللغات و علامة «.» يدل على تباينها في المعنى.

♥ اذا لاحظ القارئ كلمة «وێنه» تحت اللغات العربية فإن هناك صورة رسمها المؤلف يوضّحُ تلك اللغة في نهاية ذلك الحرف و بإمكان القارئ الرجوع إليهِ. اما اذا لاحظ كلمة «وێنه ← ...» فإنّ الصورة تقع في نهايَة الحرف الأوّل للكلمة الواقعة بعد علامة «←». و عبارة «وێنەی هەیە.» دليل على أنّ لهذهِ اللغة صورةً توضح معناها، لكنّ المؤلف لم يعيّن الصورة و المصحح ـ بعد بحثهِ في اللغات المرادفة ـ لم يظفر بها.

♥ وجود علامة «ــْ» فوق حروف اللغات الكردية إشارة الى وجود كسرةٍ مختلسة عند قراءة هذه الحروف والتي يُشارُ إليها في اللاتينية بـ «$i$».

♥ كتب المؤلف في مقدمة هذا المعجم أنّهُ كتب اللغات العربية مجرداً من «ال» حتى يقرأها القارئ كيفما شاءَ ــ معرّفاً او مُنكراً ــ.

♥ وجود علامة النقطة تحت حرف الدال في اللغات الكردية إشارة إلى عدم التلفّظ بهذا الحرف بالكامل في مدينة سنندج و نواحيها، بل يقع مخرج الدال هذا خلف مخرج حرف الياء.

♥ اشار المحقق الى تعليقاته على بعض اللغات ذيل المعجم بعلامة «ر. ر» حتى يتميّز عن حواشي المؤلّف.

♥ الكلمات الكردية والفارسية والعربية التي تحتها خط في هذا المعجم كلمات غير أصيلة في نظر المؤلف، فالكلمات العربية التي تحتها خط في هذا المعجم مأخوذة من اللغة الفارسية او الكردية.

♥ اللغات الكردية المكتوبة بين «<...>» مأخوذة من اللغات الاروبية.

في الختام تجدر الاشارة الى ان تحقيق و إعداد هذا المعجم القيم للطبع قد استغرق ثلاثة اعوام من العمل المتواصل, آمل أن ينال رضى القراء عامةً و المحققين و اللغويين منهم خاصةً.

## مقدمه‌ی فارسی مؤلف

تاریخ نشان می‌دهد، تجربه هم گواهی دارد، که هر ملتی بر ملت دیگر غلبه و استیلا پیدا می‌کند. در اخلاق و آداب و زبان ملت مغلوب، تغییرات محسوس و فاحشی تولید می‌نماید، که این تأثیر نسبت مستقیم خواهد داشت با طول مدت سلطه و نفوذ ملت غالب.

پس از استیلای سلطنت عرب بر عجم به رأی‌العین می‌بینیم که کلیه‌ی اخلاق و آداب و زبان عجم معرب شده، بلکه غالباً عربی محض گشته است. کتب و اشعار و تألیفاتی که پس از استیلای عرب در ایران نوشته شده‌اند، مُثبت این عنوان و گواه این مدعا هستند. که اگر به آن‌ها مراجعه شود می‌بینیم کلیّتاً یا عربی صرف هستند و یا اگر فارسی گفته شده‌اند درصد، نود کلمه‌ی عربی ممزوج با فارسی شده است. و اصل کلمات فارسی که کلمات عرب جای‌نشین آن‌ها شده‌اند یا به کلی محو و فراموش شده‌اند و یا به زحمت و تفحص زیاد دوباره پیدا می‌شوند.

زبان کردی نیز مانند زبان فارسی عیناً تحت همین تأثیر واقع شده. هردو کشته‌ی یک تیر

و مجروح از یک شمشیراند. برای زنده کردن این دو زبان، آخرین فکری که به نظر فقیر رسیده این است کتاب لغتی را تهیه کنیم مشتمل بر عربی و فارسی و کردی، تا هر چه از کردی و پارسی غارت شده و میت و نابود گشته است از خود کلمات عربی پس بگیریم. یعنی الفاظ عربی‌ای که همواره و همه جا مستعمل و در هر تحریر و تقریری به کار می‌روند در ردیف الفاظ کردی تنظیم نموده مرتباً فارسی و کردی گم شده را از آن‌ها پس بگیریم.

برای انجام این مقصود ترتیب کتاب را بر ردیف الفاظ کردی قرار دادیم و الفاظ عربی‌ای که در کردی و فارسی مستعمل است، در ردیف کردی توی دو کمان گذاشتیم (ـــ) تا با کردی و فارسی دوباره مشتبه نشوند.

الفاظ کردی را در بالا و در ذیل آن الفاظ فارسی را که ترجمه و مرادف کردی است، به علامت «ف» و الفاظ عربی را هم که ترجمه ی هر دو است به علامت «ع» نوشتیم. و اگر در خود کردی هم الفاظ دیگری مرادف و هم‌گزار[1] الفاظ بالایی پیدا شود به علامت «ک» نوشتم. بنابراین ترتیب، کلیه‌ی الفاظ عربی بین دو کمان قرار دارند.[2] گاهی اگر کلمات فرنگی هم پیش بیاید در بین دو سر ترنج «‹-›» نوشتیم محض مزید استفاده. شکل و شیوه‌ی غالب حیوانات و نباتات و ابنیه و وضعیات را هم آنچه مقدور بود، با قلم و مداد الوان نقش کردیم. در آخر کتاب هم آن‌چه مثل و استعارات کردی یاد داشتم، ضمیمه کردم. در ابتدا هم صرف و نحو مختصری برای مزید بصیرت و اطلاع مراجعه کنندگان تهیه نمودم. و نام کتاب را «**فرهنگ مردوخ**» قرار دادم. امیدوارم کرد و فارس و عرب هر سه بر حسب دلخواه خود از آن استفاده نمایند.

**توضیح:** پوشیده نماناد تمام الفاظی که در ردیف فارسی یا عربی برای ترجمه‌ی الفاظ کردی نوشته شده‌اند، همه با هم مرادف نیستند، بلکه بعضی با هم اختلاف دارند. لذا برای نمودن اختلاف به جای دو نقطه فاصله «:»، که علامت ترادف قرار داده‌ایم، علامت به‌علاوه «+» نگاشتیم، تا علامت تخالف باشد.[3] جهت اختلاف هم این است که لفظ کردی‌ای که در فوق ذکر شده، به تمام آن معانی متخالفه که در ذیل آن مذکورند، استعمال می‌شود. مثال: کلمه‌ی

---

۱ـ هم‌گزار: هم‌معنی و مرادف.

۲ـ در این چاپ زیر کلمات عربی خط کشیده شده است. (ر ـ ر)

۳ـ در این چاپ در بین کلمات مترادف علامت «،» و در بین کلمات غیرمتباین علامت «،» قرار داده شده است. (ر ـ ر)

«هەڵگیریاگ» به چند معنی مستعمـــل است: ۱ـ برداشته شده. ۲ـ اندوخته شده. ۳ـ پذیرفته شده. ۴ـ دنبال افتاده، یعنی زنی که به دنبال نامحرم افتاده به محل دیگـری بـرود. عربـی آن ایـن‌طـور می‌شود: ۱ـ مرفوع. ۲ـ مُدّخَر، مُحکَّر. ۳ـ مَحضون، مقبول. ٤ـ سَیِّقة، عـاهرة. که هیچ کـدام از چهار معنی مذکور با هم مترادف نیستند. لذا به جای این که لفظ «هەڵگیریاگ» چهـار مرتبـه تکرار شود، تا چهار معنی مذکور در ذیل آن نوشته شود، محض اختصار یک مرتبه نوشـتیم، و چهار معنی را با علامت اختلاف که دو خط چلیپا «+» است در ذیل آن نگاشتیم. اما در پاره‌ای موارد که جای احتیاط است، زحمت تکرار الفاظ کردی را بر علامت و اختصار ترجیح دادیـم، چنانچه در لغت «بەن» مثلاً به نظر می‌رسد. اگرچه بر حسب حقیقت، الفاظ مترادفه کمتر پیـدا می‌شوند. آن‌هایی هم که ظاهراً مترادف به نظر مـی‌رسـند، اگـر درسـت تفحـص کـنیم، معلـوم می‌شود که باز وجه اختلافی با هم دارند. و هر کدام «موضوع لَه» دیگری دارند.

اگر لفظی در دو مورد تکرار شود، گناهی بر من نیست، زیرا کتـب لغـت در هـر دو مـورد ضبط کرده‌اند. مانند «قنفذ» که هم برای «ژووژوو» ضبط شده هم برای «سیخول» کـه بـه کـردی «سووچەر» می‌گویند.

پاره‌ای از الفاظ هستند که ظاهراً تصور مـی‌رود عربـی باشـند، امّـا درسـت ملتفـت شـویم می‌بینیم در عربی معنی آن‌ها چیز دیگری است بنابراین نباید آن‌ها را عربی تلقی کرد، زیرا کـه مجرد تشابه و توافق صورت با الفاظ عرب، مستلزم عربیت نیست. مانند کلمه‌ی «انفاق» کـه در فارسی به معنی روغن زیتون است و ریخت و ترکیب آن چنان به نظر می‌دهد که عربـی باشـد. در صورتی که انفاق عربی به معنی نفقـه دادن اسـت. و هـیچ مناسـبتی بـا انفـاق فارسـی نـدارد. هم‌چنان کلمه «رد» که در فارسی به معنی (گذر) است، (رد شد یعنـی: گذشـت، رد کـرد یعنـی: گذرانید.) اما در عربی «رد» به معنی پس دادن است. یا «روح» که در کـردی بـه معنـی روی هـم مستعمل است یعنی «رصاص ابیض»، اما در عربی فقط به معنی جان اسـت. هـم چنـان کلمـه ی «نسیان» که در فارسی به معنی دشمنی و مخالفت است، ولی در عربی به معنی فراموشی است و از این قبیل... پس این جور کلمات را به جرم این که موافق یا مشابه با عربی هـستند، نبایـد از جامعه‌ی الفاظ فارسی یا کردی خارج نمایند، بلکه باید آن‌ها را غیر عربی دانست.

هم‌چنان پاره‌ای الفاظ هستند که با مختصر تحریفی یا تصحیفی در فارسی و کردی و عربی

هر سه به یک معنی مستعمل‌اند، و دلیلی که آن‌ها را اختصاص به عرب بدهد در دست نیست. پس آن‌ها را از جمله‌ی الفاظ مشترک باید شناخت، که هر کدام از این سه ملت آن‌ها را در تحریرات و تقریرات خود استعمال نمایند جای تنقید نیست. مانند کرسی، لحاف، تنور، دوات، روح، نفس، مشق، خیر، بین، حال، مال، ...،[1] ترح، زمان، زیاد، وزیر، خیال، سِحْر، سَحَر، حساب، فانوس، غیرت، ناموس و امثال آن... الفاظ عربی را غالباً به طور نکره نوشتیم (بدون حرف تعریف) تا خواننده به هر ترتیب که میل دارد ـ منکّراً یا معرّفاً ـ آن را استعمال نماید.

هر کلمه که در عربی با مختصر تصرفاتی تکرار می‌شود. معرب است ـ نه عربی ـ مانند «فَرفینج» که معرّب «پرپهنه» است، یا «شَیطَرَج» که معرّب «شاه‌تره» است. تغییرات اعراب یا تغییر حرف، علامت تعریب است مانند «فرزین» به کسر فاء که از «فَرزین» به فتح فاء مأخوذ است. یا «فرسخ» با فاء و خاء که از «پرسنگ» با پا و گاف فارسی مأخوذ است. این حروف در کلمات عربی علامت تعریب‌اند: ء، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ، س، ص، ض، ط، ظ، ع، غ، ف، ق. چنان‌که «غوغاء» معرّب «غوغا» است و «بیاده» معرّب «پیاده» و «غلط» معرّب «غَلَت» و «ثرید» معرّب «ترید» و «جرجان» معرّب «گرگان» و «حَتَل» معرّب «هَتَل» و «فرسخ» معرّب «فرسنگ» و «خِدمة» معرّب «خذمت» و «استاذ» معرّب «استاد» و «فُرصة» معرّب «پُرسَت» و «طاق» معرّب «تاق» و امثال آن‌ها....

**تنبیه:** هر لفظی را که می‌خواهند پیدا کنند، اگر مفرد است در باب خود یعنی حرف اول و دوم جویا شوند. مانند «تـاق» در باب (ت ا) باید جستجو شود. و اگر مرکب است در ابواب اجزاء ترکیبیه‌ی آن باید بگردند، تا پیدا شود. مانند «به‌هه‌وادا چوون» که در باب جزء اول مذکور است، یعنی (ب ه). هم‌چنان «چلاّوسافکون» در باب جزء اول یعنی (چ ڵ). و «دارهه‌ڵپاچین» در باب جزء دوم پیدا کنند، یعنی (ه ڵ). و لفظ «خوێنچدان» در باب (خ و) یا (پ ی) جویا شوند.

---

۱ـ این کلمه قابل خواندن نبود. (ر- ر)

## وەرگێڕدراوی پێشەکیە فارسیەکەی نووسەر

[(مێژوو ئەم راستیە دەخاتە بەرچاو، ئەزموونیش شایەتە، کە هەر میللەتێك بەسەر میللەتێکی دیکەدا زاڵ دەبێت، تاڵوگۆڕگەلێکی زەق و دزێو لە رەفتار و دابونەریت و زمانی میللەتی بەزیودا بەدیدەهێنێت، کە ئەم کاریگەریە پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بە درێژی ماوەی دەسەڵات و هێزی میللەتی زاڵەوە.

پاش زاڵ بوونی عەرەب بەسەر عەجەمدا بە ئاشکرا دەبینین کە هەموو ئاکار و دابونەریت و زمانی عەجەم تەعریب کراوە و تەنانەت زۆرجار بەتەواوی بووەتە عەرەبی. ئەو کتێب و شیعر و بەرهەمانەی کە پاش زاڵ بوونی عەرەب لە ئێراندا نوسراون سەلمێنەری ئەم راستیە و شایەدی ئەم داوا(ادّعا)یەن و ئەگەر چاوێکیان پیا بخشێنین دەبینین کە هەموویان بە زمانی عەرەبی پەتی نوسراون. ئەگەر کتێبێکیش بە زمانی فارسی نوسرابێت، لە سەدا نەوەدی وشە عەرەبیەکان لەگەڵ فارسیدا تێکەڵ بوون و بنەڕەتی وشە فارسیەکان ـ کە وشەی عەرەبی جێگاکەی پڕکردوونەتەوە ـ یا بەتەواوی سڕاونەتەوە و لە بیر کراون یا پاش ئەرك و پشکنینی زۆر دەدۆزرێنەوە.

زمانی کوردیش پڕاوپڕ وەك زمانی فارسی کەوتووەتە ژێر ئەم کاریگەریـەوە، هـەردوو کـوژراوی یەك تیر و برینداری یەك شمشێرن. بەپێی بۆچوونی ئەم هەژارە ئاخرین ڕێگەچارە بـۆ زیندووکردنـەوەی ئەم دوو زمانە ئەوەیە فەرهەنگێك بنووسم کە هەر سێ زمانی عەرەبی و فارسـی و کـوردی لـە خـۆ بگرێت، هەتا هەموو ئەو وشە کوردی و فارسیانەی کە تالآن کراون و مـردوون و فـەوتاون لـە خـودی وشە عەرەبیەکان وەربگرینەوە، واتە ئـەو وشـە عەرەبیانـەی کـە هەمیـشە و لـە هـەموو جێیەکـدا بەکاردەبرێن و لە هەر نووسین و دارشتنێکدا کەڵکیان لێوەردەگیردرێت لـە ریـزی وشـە کوردیەکانـدا دەگونجێنین و بەرەبەرە فارسی و کوردیە ونبووەکەیان لێوەردەگرینەوە.

بۆ ئـەم مەبەسـتە وشـەگەلی کتێبەکـەمان بـە پێـی وشـە کوردیـەکان ریـز کـرد و ئـەو وشـە عەرەبیانەشمان ـ کە لە فارسی و کوردیشدا بەکاردەبرێن ـ لە ڕیـزی وشـە کوردیـەکان و لـە نـاو دوو کەوانەدا دانا، هەتا جارێکی تر لەگەڵ وشە کوردی و فارسیە کاندا تێکەڵ نەبنەوە.

وشە کوردیەکانمان لە سەرەوە نووسی و لە ژێریانەوە وشە فارسیەکانم بە نیـشانەی «ف» دانـا، ـ کە وەرگێڕدراو و هاوواتای وشە کوردیەکانە و وشە عەرەبیەکانیشم ـ کە وەرگێڕدراوی هەردووکیانـە ـ بە نیشانەی «ع» نووسی و ئەگەر لە خودی زمانی کوردیدا وشەگەلێکی دیکـە دەسـتکـەوتبێت کـە هاوواتای وشەکانی سەرەوە بن، ئەوانیـشمان بـە نیـشانەی «ك» نووسـی. بـەم پێیـە هـەموو وشـە عەرەبیەکان لە نێوان دووکەوانەدا دانراوە.[1] هەندێ جار بۆ کـەڵكگەیانـدنی زیـاتر ئەگـەر وشـەگەلی ئەورووپاییشم بەرچاوکەوتبێت ئەوانیشم لە نێوان دوو سەرەڕمدا (<-->) نووسیوە. بە پێی توانا وێنە و نیگاری زۆربەی گیانداران و ڕووەکگـەل و خانووگـەل و شێوەگەلیـشم بـە قەڵـەمڕەنگ کێـشا. لـە کۆتایی[2] کتێبەکەشدا هەر پەند و ئیدیۆمێکی کوردیم لە بیر بووبێـت خـستوومەتە سـەر کتێبەکـە و ناوم نا «فەرهەنگی مەردۆخ»، هیوادارم کـورد و فـارس و عـەرەب هەرسـێکیان بـە پێـی ویـست و دڵخوازی خۆیان کەڵکی لێوەرگرن.

**ڕوونکردنەوە:** شایانی باسە هەموو ئەو وشانەی کە لە ریزی مانا فارسی یا عەرەبیەکەدا نوسراون پێکەوە هاوواتا نین، بەڵکوو هەندێکیان جیاوازییان لە نێواندا هەیە، بۆ ئاشکرا کردنی ئـەو جیاوازیـە لە بری جووتخاڵ (:)[3] - کە بە نیشانەی هاوواتابوونمان داناوە ـ نیشانەی کۆکردنەوە (+)[4]مان دانـا، تا نیشانەی جیاوازی بێت. هۆی جیاوازبوونەکەش ئەوەیە کە ئەو وشە کوردیەی لە سەرەوە نوسـراوە،

---

١ـ ئەم جۆرە وشانە لەم چاپەدا لە باتی دووکەوانە، خەتیان بە ژێردا کێشراوە. (ر ـ ر)

٢ـ پەند و ئیدیۆمەکان لەم چاپەدا لە کۆتایی پێشەکی فەرهەنگەکەدا دانراون هەتا تێکەڵی فەرهەنگەکە نەبێت.(ر ـ ر)

3ـ لەم چاپەدا لە باتی جووت خاڵ(:)، نیشانەی «،» بۆ هاوواتابوون دانراوە. (ر ـ ر)

٤ـ لەم چاپەدا لە باتی خاچ(+)، نیشانەی «.» بۆ جیاوازی لە مانادا دانراوە. (ر ـ ر)

هەموو ئەو مانا جیاوازانە دەگەیەنێت کە لە خوارەوەیدا نوسراوە. بۆ نموونە وشەی «هەڵگیریاگ» /لە زمانی فارسیدا/ چەند مانا دەگەیەنێت: ١- برداشته شده ٢- اندوخته شده ٣- پذیرفته شده ۴- دنبال افتاده (یعنی زنی که دنبال نامحرم افتاده به محل دیگر برود). مانا عەرەبیەکەشی بەم شێوەیە: ١- مَرفوع ٢- مُدّخَر، مُحتَکر ٣- مَحضون، مقْبول ۴- سَیِّقَة، عاهِرَة. کە هیچکام لەم چوار مانایە هاوواتا نین. هەر بۆیە لە باتی ئەوەی چوار جار وشەی «هەڵگیریاگ» دووبارە بکرێتەوە هەتا ئەو چوار مانایە لە ژێریدا بنووسرێت؛ بۆ کورتکردنەوە یەکجار وشە کوردیەکەمان نووسی و لە ژێریدا هەر چوار ماناکەمان بە نیشانەی جیاوازیەوە - کە خاچە(+)[1]- پێکەوە نووسی. بەڵام هەندێ جار - کە وردەکاری و خۆپاراستن پێویستترە - زەحمەتی دووبارەکردنەوەی وشە کوردیەکەمان بەسەر کەڵکوەرگرتن لە نیشانە و کورتکردنەوەدا هەڵبژارد، هەروەکوو لە وشەی « بەن » دا دەبینرێت. هەرچەندە لە ڕاستیدا وشەی هاوواتا زۆر کەمە و ئەگەر باش رابمێنین، بۆمان دەردەکەوێت کە تەنانەت ئەو وشانەش کە بە ڕواڵەت لە هاوواتا ئەچن لە ڕوویەکەوە جیاوازیان هەیە و هەرکامیان بۆ واتایەکی سەربەخۆ دانراون.

ئەگەر وشەیەك لە دوو شوێندا دووبارە بێتەوە خەتای من نیـیە، چونکە لە فەرهەنگەکاندا بە هەردوو شێوە تۆمار کراوە، وەکوو وشەی «قنفذ» کە هەم بۆ «ژووژوو» تۆمار کراوە و هەم بۆ «سیخول» کە لە کوردیدا «سووچەڕ»ی پێدەڵێن.

هەندێ وشە هەیە کە لە ڕواڵەتدا لە عەرەبی دەچن بەڵام ئەگەر باش سەرنج بدەین بۆمان دەردەکەوێت کە لە عەرەبیدا مانایەکیتریان هەیە. هەر بۆیە نابێت بە عەرەبیان لە قەڵەم بدەین، چونکە تەنیا لەیەکچوون و وەکیەکبوونی ڕواڵەتیی لەگەڵ وشەی عەرەبیدا بە مانای عەرەبیبوون نیە. وەکوو وشەی «انفاق» کە لە فارسیدا مانای «ڕۆن زەیتوون» دەدات، بەڵام لە شێوە و ڕواڵەتدا وەك عەرەبی دەکەوێتە بەرچاو، لە کاتێکدا کە «انفاق»ی عەرەبی بە مانای «نەفەقە (بژیو) پێدان»ە و هیچ تەباییەکی لەگەڵ «انفاق»ی فارسیدا نیە. هەروەها وشەی «رد» کە لە فارسیدا مانای «تێپەڕین» دەدات (رد شد: تێ پەڕی، رد کرد: تێی پەڕاند)، بەڵام «رد» لە عەرەبیدا بە مانای «دانەوە»یە. هەروەها «روح» کەلە کوردیدا مانای «قورقوشم»یش دەدات، بەڵام لە عەرەبیدا تەنیا بە مانای «گیان»ە و هەروەها وشەی «نسیان» کە لە فارسیدا بەمانای «دوژمنی» و «ناتەبایی»ە، بەڵام لە عەرەبیدا بە مانای «لەبیرکردن»ە و... هتد. کەواتە نابێت ئەم وشانە بە تاوانی هاوشێوەبوون لەگەڵ وشە عەرەبیەکاندا لە کۆمەڵگای وشە فارسیەکان یا کوردیەکان دەربکرێن،

---

[1] ـ هەروەکوو پێشتر ئاماژەی پێ کرا لەم چاپەدا لە باتی «+» نیشانەی «.» دانراوە. (ر ـ ر)

بەڵکوو پێویستە ئەم وشانە بە ناعەرەبی بزانین.

هەروەها هەندێ وشە هەیە کە لە هەر سێ زمانی فارسی و کوردی و عەرەبیدا بـە جیاوازیـەکی بچووك لە پیت و نوختەدا بە یەك مانا بەکاردەبرێن و هیچ بەڵگەیەك لەبەردەستدا نیە کـە تایبـەتیان بکات بە زمانی عەرەبییەوە. کەواتە پێویستە بە وشەی هاویەشیان لە قەڵەم بـدەین کـە هـەرکام لـەم سێ میللەتە لە نووسین و دارشتنی خۆیاندا کەڵکیان لێوەرگرن تووشی هیچ رەخنەیەك نـابن. وەکـوو وشەگەلی: لەحاف، تەنوور، دەوات، رۆح، نـەفس، مەشـق، نـامووس، غـیرەت، خێـر، بـەین، مـاڵ حاڵ،...[1]، تەرح، زەمان، زیاد، وەزیر، خەیاڵ، سیحر، سەحەر، حیساب، فانووس و...

وشە عەرەبیەکانمان بە شێوەی نەناس (بەبێ ئامرازی ناسـێنەری «ال») نووسـی، هـەتا خوێنـەر بەهەر شێوەیەك کە دەیەوێت (نەناس یا ناسراو) بەکاریانبهێنێت.

هەر وشەیەك کە بە ئاڵوگۆڕێکی کەمەوە لە عەرەبیدا دووبارە دەبێتەوە ئەوە تەعریبکـراوە نـەك عەرەبی. وەك «فرفینج» کە تەعریبکـراوی «پرپهنـــە= پەڵپینە»یـە، یـا «شـیطرج» کـە تـەعریب کراوی «شاەتر= شاتەڕە» یە.

ئاڵوگۆڕ لە بزووتن (سەر و بۆر و ژێر) یا لـە پیتدا نیشـانەی تەعـریبکرانـە، وەك «فِرزین» کە لە «فَرزین»ەوە وەرگیـراوە، یا «فرسـخ» بە فێ و خـێ کـە لـە «پرسـنگ» بـە پـێ و گافـەوە وەرگیراوە.

ئەم پیتانە لە وشە عەرەبیەکاندا نیشانەی تەعریب کرانـە: و، ت، پ، ج، ح، خ، د، ژ، س، ص، چ، گ، ڤ، ع، غ، ف، ق. هەروەك ئەم نموونانە:

| | | |
|---|---|---|
| - « غوغـا ء» | تەعریب کراوی | « غەوغا »یە. |
| - « بیـادە » | تەعریب کراوی | « پیادە »یە. |
| - « غلـط » | تەعریب کراوی | « غەڵەت »ە. |
| - « ثریـد » | تەعریب کراوی | « ترید = تریت »ە. |
| - « جرجان » | تەعریب کراوی | « گورگان »ە. |
| - « خَتَـل » | تەعریب کراوی | « هەتەل »ە. |
| - « فرسخ » | تەعریب کراوی | « فەرسەنگ »ە. |
| - « خِدمة » | تەعریب کراوی | « خزمەت »ە. |
| - « استاذ » | تەعریب کراوی | « ئوستاد »ە. |
| - « فرصة » | تەعریب کراوی | « پُرسَت »ە. |

[1]ـ ئەم وشەیە لە دەستنووسەکەدا نەخوێندرایەوە. (ر ـ ر)

- « طـاق »          تەعریب کراوی          « تاق »ە.

**تێبینی:** هەر وشەیەك کە [لەم فەرهەنگەدا] بۆی دەگەڕێن ئەگەر وشـەیەکی سـادە بـوو هـەر لـە پاژی خۆیدا واتە بە پێی دوو پیتی یەکەم و دووەم بۆی بگەڕێن، وەکوو وشەی « تاق » کـە پێویـستە لە پاژی « ت ا » دا بۆی بگەڕێن و ئەگەر وشەکە لێکدراو بوو لە پاژگـەلی بەشـە پێکهێنەرەکانیـدا بۆی بگەڕێن، وەکوو « بەهەوادا چوون » کـە لـە پـاژی بەشـی یەکەمـدا واتـە لـە « ب ه » دایـە. هەروەها « چلاوسافکون » کە لە پاژی بەشی یەکەم واتە لە « چ ڵ » دایە و « دارهەڵپاچین » کە لە پاژی بەشی دووەمـدا واتـە لە « ه ڵ » دایە و وشەی « خـۆ پێچ دان » کە لـە پـاژی « خ ۆ » یا « پ ی » دایە.)]

## ڕێـزمانی کـوردی

### واژەناسی[1]

قسەی کوردی لە واژە[2] دوروس ئەوێ. واژە لە نووکە[3] دوروس ئەوێ. نووکە سیوشەش جۆرە، بـۆ نووسین ئەم سیوشەش جۆرە، سیوشەش شێوە دانریاگە، بەم جۆرە:[4]

ع ا ب بٚ پ ت ث ج چ ح خ د ڊ ذ ر ڕ ڒ ز ژ س ش

ف ق ک ڭ گ ل ڵ م ن و ۆ ۊ ه هٚ ی ێ

ئەم سیوشەش نووکە، هەشتی بە لچ دوروس ئـەوێ: ب بٚ پ م ف و ۆ ۊ

پەنجیچی بە گەڵوو دوروس ئـەوێ: ق خ ع ه ح

---

١ـ علم صرف.[زانـستی وشەسازی]

٢ـ واژە، واچە، واتە. هر سە بە معنی «کلمە» یا «لفظ» هستند.[هەرسێکیان مانای «کلمە» یا «لفظ» دەگەیەنن.]

٣ـ «نووکە» بە معنی «حرف» است.[«نووکە بە مانای «حرف» ە.]

٤ـ «هٚ» بە جای « ۊ » گاهی استعمال میشود. [هەندێ جار «هٚ» لە باتی « ۊ» بەکار دەهێنرێت.]

ئەو بیسروسیەکەی لە ناو دەما دوروس ئەون:

ت ێ د ن ل . س ش ح چ . ڕ ذ ژ . ر ڕ ڵ ی . ا د ۆ ێ . ک ڬ ک گ

نووکەگەل کوردی، برێ جار « نەجْمن »، برێ جار « بـجْمن ». بۆ ناسین جوولەی ئـەو بجمگەلـە، سێ شێوە دانریاگە: سەر ( ـَ )، ژێر ( ـِ ) بۆر ( ـُ ). نووسین بەم نووکـە و جوولەگەلـە، گێـچەڵ و سەخڵەتی سەخت و سەنگینی هەس. کورد و عەجەم بـە دەس نـەپـوێری و ناکڵۆکـاری ئـەم نووکـە و جوولەگەلەوە بەتەنگ هاتگن. بۆ ئاسانکردن نووسین، من ئەم سی و هەشـت شـێوەمە دانیاگـە، تـا کورد و عەجەم فێر بْون بەم نووکەگەلە بنووسن، لە گێچەڵ نووکەگەل کۆنە ئاسوودە بْون.

## نووکەگەل کوردی

نووکەگەل کوردی

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ء | ت | ڊ | س | گ | ۆ |
| ا | ج | ذ | ش | ل | ۊ |
| ب | چ | ر | ف | ڵ | ه |
| ب̆ | ح | ڕ | ق | م | ە |
| پ | خ | ز | ک | ن | ی |
| ت | د | ژ | کپ | و | ێ |
| ص | ع | غ | ط | ض | ظ |

ژمارەی کوردی — ١ - ٢ - ٣ - ٤ - ٥ - ٦ - ٧ - ٨ - ٩ — ١٠ - ١١ - ١٢ - ١٣ - ١٤ - ٢٠ - ٣٠ - ١٠٠

ئەم شەش نووکە « ت ـ د ـ ر ـ و ـ هـ ـ ی » لە قسەکردن کوردیا دوو جۆر ئەخوێنگێن:

ــ گایێ سەنگین، وەك: « ماووت، زەردی، ڕچیان، بووچك، ئاه، بیر ».

ــ گایێ سۆك ئـەخوێنگێن، وەك «ناوت ، خودا، بڕاڵە، بۆچە، بنە، بێڕا»

بۆ ناسین سەنگینی و سوێکی ئەم پەنج نووکە، ئـەم نـشانـەمان دانیـا « ˇ ». نـاوی «نـشانەی سۆکیە». لە بان هەر نووکەیکەو بوێ، ئەو نووکە سوك ئەخوێنرگێ، بـەڵام گـایێ بـۆ ئاسـانی تـەنیا

نوختەیك لە ژێر [ئەو] نووكەگەلەو دائەنن، كار [كەهەر] نشانەی سۆكی ئەكا
ئەم نووكەگەلە لــە كوردیــا نــین: « ث ـ ص ـ ض ـ ط ـ ظ ». بـۆ ئەمــە لــە نووسـینا پــەكمان نەكەفێ، بۆ ئەمانیچە شێوەمان دانیا. بەم جۆرە: [سەیری خشتەكە بكە].

بــۆ سەر و ژێر و بۆر و گیره[1]، ئـــــەم چوار شێوەمانە دانیا، [كە] لەتــەك نـــووكەگـەلا بــە یەكـــــەو ئەنووسگێن ـ « ّ » ـَـ سـەر. « ٍ » ـِـ ژێر. «ە» ـُـ بـۆر. «ـ» ـْـ ســوٚكی. «٠» ـّـ گیره.

لە خەت فارسی و تاتیا[2]، نشانەی سۆكی لە بان نووكەوە ئەنووسرگێ ـ ئەگەر نوختــە[3] بێــت لــە ژێرەو ئەنووسگێ ـ. نشانەی گیره، لە ژێر نووكەدا ئەنووسرگێ. لە كوردیا كێشە[4] نیە، چون هــەمزە و ئەلف هەردووكیان ئەنووسگێن، ئیتر ئەوەجەی كێشەی نیە. نووكەی گیریــاگ[5] لــە كوردیــا بــە یــەك نووكە ئەشمێرگێ. لە خەت كوردیا تا واژە كۆتایی نەیت، نووكەگەل لە یەك نابچڕگێن. بەم جۆرە:

به خەت فارسی:

لَم خَرگـای چـــَـرخا مِنِ شیـــدائی
چاویـــكم كـرِدَو لــه بُـو بینــائی

هـر چـــَنَـم كوشا كَـس خَـورَوْ نَـوْ
لــه تَنیائیــا منیـــچ چُـــومه خَــوْ

[لـەم خـەرگای چـەرخا، مــنی شـیدایی
چـــاوێكم كـــــردەو لـــەبۆ بینـــایی

هەرچـــەنم كۆشـــا، كەس خـــەوەرەو نـــەو
لــە تــەنیاییا منــیچ چـــوومە خـــەو]

[1] ـ گیره: شدّة.

[2] ـ تاتی: عەرەبی.

[3] ـ ئەم وشەیە لە دەستنووسەكەدا باش ناخوێنرێتەوە. (ر ـ ر)

[4] ـ كێشە: مدّ.

[5] ـ گیریاگ: مشددّ.

تاتی[1] لە زوان کوردیا نیە. تەواو واژەگەل کوردی گشتیان بێ تاتین. یانێ نووکەی دواگین واژەگەل کوردی نەجْمن[2]. گای[3] لە سای خدبیەدانا[4] ژێر خدێدریاگ[5]، ئەوێ بە «ی» وەك: «دەرد سەر»، ئەیژن «دەردی سەر». هەر ئەمە بۆ کورتی زوان کوردی کۆمەك گەورەیکە. ئەیژی: «رۆسەم هات»، «وتم بە رۆسەم»، «رۆسەمیان برد» لە هەر سێ سەبارەتا[6] میم رۆسەم نەجْمە.

«ئەلف» هەرگیز جووڵە ناکا، هەمیشە نەجْمە. هەر لە بەر ئەمە هەرگیز ناکەفێتە سەر واژەوە. بەڵام «هەمزە» هەمیشە ها لە سەر واژەوە. ئەگەر لە ناوڕاس یا بن واژەدا هەمزەیك بوینین، ئەزانین ئەو واژە کوردی نیە، وەك: مەئخەذ، جوزء.

«ی»ی تەنیایی[7] هەمیشە سوکە، *[وەك:]* پیاگێ، ئەسپێ، نیمکەتێ.

«ة» لە کوردیا نیە، ئەگەر واژەیك عەرەبی کە «ة»ی بوێ، بکەفێتە ناو کوردی، درێژ ئەنوسگێت. وەك: «رحمة» بەم جۆرە ئەینووسین: «رەحمەت».[8]

## «دەسوور گۆڕیان نووکەگەل»

«ه»ی سوك ئەگەر بکەفێتە ناوڕاس واژە، نووکەی لەوەوبەری هەر جووڵەیکی بوێ، ئەمیچ ئەوێتە نووکەیك *[کە]* لە تەك ئەو جووڵەدا جۆر بکەفن. یانێ ئەگەر جووڵەی بەرگ سەر بێ، ئەوێ بە «ئەلف»، ئەگەر ژێر بێ، ئەوێ بە «ی»، ئەگەر بۆر بێ ئەوێ بە «و»، وەك: «مارە، مێروان، مۆرە» کە لە بەرا «مَهرە، مِهروان، مُهرە» بووگە.

برێ نووکەگەل تر هەن، لە تەك یەکترینا ئەگۆڕگێنەو، یانێ *[لە]* باتی یەکتری ئەوێژرگێن و ئەنووسرگێن. وەك ئەمانە:

- ث.س: غەیاث، هەیاس.

---

١ـ تاتی: اعراب.

٢ـ نەجْم: ساکن.

٣ـ گاهی.

٤ـ خدیەدان: اضافە.

٥ـ خدێ دریاگ: مضاف.

٦ـ سەبارەت: حالت، صورت.

٧ـ تەنیایی: وحدت

٨ـ نارکاری، یانێ «مصدریە» لە تاتیا ئەگەر وێسان بە سەریەو ڕەوا بێ، گرد ئەنووسرگێ، وەك: «سنَّة، منة». ئەگەرنە درێژ ئەنووسرگێت وەك: «حشمت، مناجات، صحبت، وحدت».

- (ح.ه): حەش، هەش. حۆش، هۆش.

- (خ.و): خوەش، وەش.

- (خ.ح): خوناق، حوناق.

- (خ.ع): خوناق، عوناق.

- (د.و): خودا، خوا. (خُدا، خوا)

- (د.ت): دوانچە، توانچە.

- (د.ذ): خدمەت، خذمەت.

- (ر.ڵ): صیرات، صەڵاط.

- (ر.ل): برۆ، بلۆ.

- (ز.ت): سوورزیان، سووتیان.

- (ز.س): پەچەخوز، پەچەخوس.

- (س.ز): دەسگیر، دەزگیر.

- (ژ.ج): ریژە، ریجە.

- (س.ر): خستن، خریان.

- (ش.ت): فرۆشیاگ، فرۆتیاگ.

- (ش.ژ): کوشتن، کوژیاگ.

- (ش.ڵ): هیشتن، تیڵی.

- (ص.س): صیراط، سەڵاط.

- (ط.ت): صیراط، سەڵاتە

- (ع.ح): جمعە، جمحە.

- (ع.ا): مەعرەکە، مارکە.

- (ع.ی): میعراج، میراج.

- (ع.خ): عوناق، خوناق.

- (غ.ه): غەیاث، هەیاس.

- (ع.و): موعجزە، مووجزە.

- (غ.ق): غەیاث، قەیاس.

- (ف.و): ژنەفتن، ژنەویان.

- (ڵ.ل): مەڵا، مەلا.

- (م.ن): بەلام، بەلان.

- (ی.ا): ژمێریان، ژماریان.

- (م.ب): موسولمان، بوسولمان.

- (م.و): دەمانچە، دەوانچە.

دوایـی واژەزانـی تواشاکە.

## «واژە»

**واژە[1] سێ جۆرە:**

١. یا بۆ ناسین چتگەل دانریاگە و یـەکێ لـە سـاگەلی نیـە لـە تـەکا، [وەك:] ئەوسـا، ئیـسا، لەمەوسا.

ئەوە پی‌ئەیژن: «ناو»[2]، وەك: رۆسەم، چنار، ئەسپ، کوچـك بنـچك، دووکـەلێ، مـژ، دەنـگ، رەنگ، مەزە، هۆش، زانست، زۆر.

٢. یا بۆ ناسین کردەوەگەل[3] دانریاگە و یەکێ لە ساگەلیچی لـە تـەکا هـەس. ئـەوە پـی‌ئەیـژن: «کردار»[4]، وەك: بردی، کردی، شماردی، نووسی، هەلسا، دانیشت. ئەنووسێ، ئەڕوێ. بڕۆ، بنووسە.

٣. یا بۆ لکانن و بە یەکەو بەستن ناو و کردارگەل دانریاگە، یانێ تا لـە تـەك نـاو یـا کردارێکـا نەوێ، بە تەنیا خوەی گوزارەی دوروسێکی نیە. ئەوە پی‌ئەیژن «پیتـەك»[5]، وەك: ا، ب، ی، بـا، تـا، نە، مە، لە، لێ، تەك.

## «نـاو»

**ناو دوو جۆرە:**

١) یا لە یەك واژە دورووس بووگە. ئەوە پی‌ئەیژن: «ناو سـادە»[6]، وەك: بولبـولێ، قەلـەم، کتێـو، فەلامەرز، خوەر، مانگ.

---

[1]ـ واژە: کلمە، لفظ.

[2]ـ ناو: اسم.

[3]ـ کردەوەگەل: کردارها.

[4]ـ کردار: فعل.

[5]ـ پیتەك: حرف.

[6]ـ ناو سادە: اسم مفرد.

۲) یا له دوو واژه یا زیاتر دوروس بووگه. ئەوە پـێ‌ئەیـژن: «نـاو پـەیوەس»[۱]، وەك: خـواداگ، باخەوان، خوەرەتاو، گلاو.

**ناو ساده له سەبارەت نووکەبەننیەو[۲] چەن جۆرە:**

- ✓ یا دوو نووکەییه (یانێ له دوو نووکه دوروس بووگه)، وەك: پەڕ، بەڕ، پەز، گا، کا.
- ✓ یا سێ نووکەییه، وەك: ئاو، باز، ئەسپ.
- ✓ یا چوار نووکەییه، وەك: کالەك، قالی، واشه، کلاو.
- ✓ یا پەنج نووکەییه، وەك: بێشکه، سیسرك، ترۆزی.
- ✓ یا شەش نووکەییه، وەك: پلێسرك، هەورێشم، مەریوان.
- ✓ یا حەفت نووکەییه، وەك: کەرگەدەنگ، هەورامان.
- ✓ یا هەشت نووکەییه، وەك: شاربازێڕ، ناونیرۆك.
- ✓ یا نۆ نووکەییه، وەك: سارۆقامیش، مێشلەزەرگۆ.

**ناو پەیوەس** له چوار نووکەییەو تا شانزە نووکـەیی هـەس. نـاو سـاده بـه هـیچ جـۆر دەسـی لێ‌نادرگێ، هەر جۆر لەبەرا دانریاگه، یا ژنەویاگـه، ئەشـێ هـەر بـەو جـۆره بنووسـگێ و بوێـژگێ. پێتەکیچ هەر بەو جۆره دەس ناخوا.

## «ناو کار»[۳]

**ناو چەن جۆره:**

۱ـ یا ناو چته، وەك: کوچـك، بنچك، دار، دیوار، رۆسەم، مەحموود.

۲ـ یا ناو گوزارەس، وەك: هۆش، زانست، زرنگی، گەوجی.

۳ـ یا ناو کاره، وەك: بوون، کردن، خەفتن، کریان، بریـان، نووسـین، تاشـین، شمـاردن، هەلـسان، دانیشتن.

نشانەی ناو کار یا«ن» تەنیاس، یا «تن» یا «دن»، یا «انْن»، یا «یان»ه.

«هاتوچو» له کارگەل «دووبڕیاگ»[٤]ن، لەبەرا «هاتن و چوون» بووگن.

---

۷ـ ناو پەیوەس: اسم مرکب.

۱ـ نووکەبەننی: حرفبندی.

۲ـ ناوکار: اسم مصدر.

۳ـ دووبڕیاگ: مرخّم.

## «کار یەکلایی [و] کار دوولایی»

**کار دوو جۆرە:**

١ـ یا بۆ درووس‌بوونی یەك چت بەسە. ئەوە پی‌ئەیـژن: «کـار یـەکلایی»[1]، وەك: بـوون، رویـن، هاتن، خەفتن، مردن، شکیان، رژیان.

**ـ یەکیٚ بوو.**

**ـ رۆسەم رۆی.**

**ـ گوودەرز هات.**

**ـ زۆراو خەفت.**

**ـ بورزو مرد.**

**ـ قەڵەمەکە شکیا.**

**ـ دەواتەکە رژیا.**

٢ـ یا بۆ درووس بوونی یەك چت بەس نیە *[و]* تا دوو چت نەویٚ درووس ناویٚ، ئـەوە پـی‌ئەیـژن: «کار دوولایی»[2]، وەك: وتن، کردن، نووسین، برین، درین، شکانْن، رژانْن.

ـ رۆسەم قسەکەی وت. (تا رۆسەم و قسەکە هەردوکیان نەون کار وتن درووس ناویٚ).

یا ئەیژی:

**ـ مامر هیلکەی کرد.**

**ـ زۆراو کاغەزی نووسی.**

**ـ ئەسپەکە هەوسارەکەی بڕی.**

**ـ ئەحمەد کتیٚوەکەی دڕی.**

**ـ کوچـْك شیشەکەی شکان.**

**ـ کڵك ماسەکەی رژان.**

تا بکەر و کریاگیٚ نەویٚ هیچکام لەو کارگەلە درووس ناون.

## «کردار»

---

١ـ کار یەکلایی: فعل لازم.

٢ـ کار دوولایی: فعل متعدی.

**کردار[1] دوو جۆرە:**

➤ یا سادەس[2]، وەك: بڕی، دڕی، خەفت، نووسی.

➤ یا پەیوەسە[3]، وەك: هەڵسا، دانیشت، سەردەو بوو، قینی کرد، بەرەودوا بوو.

**کردار سادە لە سەبارەت نووکەبەننیەو چوار جۆرە:**

١ـ یا دوو نووکەییە، وەك: بوو، چوو، ما، دا، دی، سەن.

٢ـ یا سێ نووکەییە، وەك: کرد، برد، خەفت، ڕۆی، هات.

٣ـ یا چوار نووکەییە، وەك: فرۆت، کرۆت، دۆشی، کۆشی.

٤ـ یا پەنج نووکەییە، وەك: خوارد، شمارد، بگارد، فرۆشت.

کردار پەیوەس شایەد تا پانزە نووکەیچ بوێ.

کردار[4] ئەگەر لە کار یەکلایی دورروس کریاوێ ئەویچ یەکلاییە، *[وەك:]* هاتن، هات. ڕژیان، ڕژیا. خەفتن، خەفت.

ئەگەر لە کار دوولایی دورروس کریاوێ ئەویچ دوولاییە، *[وەك:]* نووسین، نووسی. فرۆتن، فرۆت. ڕژانن، ڕژان. خەفانن، خەفان.

## «کردار بگردگ و کردار نەبگردگ»

**کردار دوو جۆرە:**

✦ یا لەمەوبەر بووگە، ئەوە پێئەیژن: «بگردگ»[5]، وەك: ڕۆی، هات، بردی، خەفت.

✦ یا ئیسە، یا لەمەودوا ئەوێ، ئەوە پێئەیژن: «نەبگردگ»[6]، وەك: ئەڕوێ، تێ، ئەوا، ئەخەفێ. (ئیسە یا لەمەوسا.)

**کردار بگردگ پەنج جۆرە:**

١ـ یا کردارێکە لەمەوبەر کریاگەو بردگە، ئەوە پێئەیژن: «بگردگ رووت»[7]، وەك ئەیژی: یەکێ بوو، ڕۆسەم ڕۆی، ئەحە ئەسپەکەی برد.

---

٣ـ کردار: فعل.

٤ـ سادە: بسيط.

١ـ پەیوەس: مرکب.

٢ـ کردار: فعل.

٣ـ بگردگ: ماضي.

٤ـ نەبگردگ: مضارع.

٥ـ بگردگ رووت: ماضی مطلق.

٢ـ یا کردارێکە لەمەوبەر نازانین کریاگە یا نە، ئەوە پێئەیژن: «بگردگ ناپاوەجێ»[1]، وەك ئەیژی: یەکێ بووێ، رۆسەم رویوێ، ئەحە ئەسپەکەی بردوێ، نالّی کردوێ.

٣ـ یا کردارێکە لەمەوبەر کریاگە و کەمێ دوورە، ئەوە پێئەیژن: «بگردگ دوور»[2]، وەك ئەیژی: ئەحە ئاوپاشی کردگە، مەحە ئەسپەکەی بردگە.

٤ـ یا کردارێکە لەمەوبەر کریاگە و فرە دوورە، ئەوە پێئەیژن: «بگردگ دوورتر»[3]، وەك ئەیژی: ئەحمەد ئاوپاشی کرْدوو، موحەممەد ئەسپەکەی بردْوو.

٥ـ یا کردارێکە لەمەوبەر کریاگە و ڕۆشن نیە هێشتا بگردوێ، ئەوە پێئەیژن: «بگردگ نەزیك»[4]، وەك ئەیژی: رۆسەم ئاوپاشی ئەکرد، زۆراو ئەسپەکەی ئەبرد.

**واژەی کردار بگردگ** (خوا رووت بێ، یا ناپاوەجێ، یا نەزیك، یا دوور، یا دوورتر) **شەش جۆرە:**

١ـ یا کردار بوێژە[5]: وتم، نووسیم.

٢ـ یا کردار بوێژگەلە[6]: وتمان، نووسیمان.

٣ـ یا کردار بژنەوە[7]: وتت، نووسیت.

٤ـ یا کردار بژنەوگەلە[8]: وتتان، نووسیتان.

٥ـ یا کردار کەسێ ترە[9]: وتی، نووسی.

٦ـ یا کردار کەسگەل ترە[10]: وتیان، نووسیان.

## «کردارسازی»

کردار بگردگ لە ناو کار[11] دورووس ئەوێ. بەم جۆرە: «ن» کە نشانەی کارە، لە دوای واژەی کارەو لائەوەین، ئەوێتە بگردگ، وەك: رْوین، دۆشین، کۆشین، بردن، خەفتن. «ن»کە نشانەی کار بوو لە دوای گشتیانەوە لامان برد، بوون بە: رْوی، دۆشی، کۆشی بردی، خەفت. ئەمانە گشتیان کردار بگردگن.

---

٦ـ بگردگ ناپاوەجێ: ماضی [ناپایدار].

١ـ بگردگ دوور: ماضی بعید.

٢ـ بگردگ دوورتر: ماضی ابعد.

٣ـ بگردگ نەزیك: ماضی قریب.

٤ـ بوێژ: متکلم.

٥ـ بوێژگەل: جمع متکلم.

٦ـ بژنەو: مخاطب.

٧ـ بژنەوگەل: جمع مخاطب.

٨ـ کەسێتر: جمع غایب.

٩ـ کەسگەل تر: جمع غایب.

١٠ـ ناوکار: اسم مصدر.

کردار نەبگردگ لە کردار بگردگ دوروس ئەویٚ. بەم جۆرە: «ا» کە نشانەی نەبگردنە لەبەر واژەی بگردگەو دائەنێن و ئاخری سوك ئەکەین ئەوێتە نەبگردگ، وەك: رْوی، دۆشی، کۆشی، تاشی. ئەلفمان لە بەردەمیانەو دانیا، بوون بە: ئەڕویٚ، ئەدۆشیٚ، ئەکۆشیٚ، ئەتاشیٚ. نووکەی دواگین نەبگردگ بۆ بوێژ سەنگین ئەخوێنرگیٚ، بۆ کەس‌تر سوك ئەخوێنرگیٚ.

هەر بگردگیٚ نووکەی دواگینی «ی» بیٚ، وەك: رْوی، نووسی، زانی. واژەی نەبگردگی هەر بەم جۆرە لیٚ‌دوروس ئەویٚ. بەڵام نەبگردگگەلیٚ کە دوایان «ت» یا «د» یا «ن» بیٚ، بەم جۆرە واژەی نەبگردگیان لیٚ‌دوروس ناویٚ. بەڵکوو بەم جۆرە ئەون بە واژەی «بگردگ نەزیك» [وەك:] ئەبرد، ئەشمارد، ئەخەفت، ئەفرۆت، ئەشێوان، ئەباران. لەبەر ئەم شێویانە بەم دەسوورە رەفتار ئەکرگێت: ئەگەر دوای واژەی بگردگ «ت» بێت، نووکەی واژەی یەکلاییچ لەتەك دوولاییا یەك‌جۆر بن، «ت»ەکە لائەوەین، «ی»ی سوك ئەنینە جێگەی، ئەوێتە نەبگردگ، وەك: خەفت، ئەوێتە: ئەخەفیٚ. کەفت، ئەوێتە: ئەکەفیٚ. بەست، ئەوێتە: ئەبەسیٚ یا ئەوەسیٚ. بەڵام ژنەفت ئەوێتە: ئەژنەویٚ. فرۆت ئەوێتە: ئەفرۆشیٚ. کوشت ئەوێتە: ئەکوژیٚ. لەبەر چە؟ لەبەر ئەمە واژەی یەکلایی «ژنەفتن» بە «ف»، «فرۆتن» بە«ت»، «کوشتن» بە«ش»، لە ریشەدا[1] «ژنەویان» بە «و»، «فرۆشیان» بە «ش» «کوژیان» بە «ژ» بووگە.

یەکلایی ریشەس، دوولایی وەچە[2]، کردارسازی لەسەر ریشە ئەڕویٚ [بەم جۆرە کە] ئەگەر دوای بگردگ «رد» بیٚ، هەردکی لائەوەین، ئەلفێك ئەنینە جێگەیان ـ ئەگەر خوەی ئەلفی نەویٚ ـ ئەوێتە نەبگردگ وەك: «کرد» ئەوێتە «ئەکا»، «برد» ئەوێتە «ئەبا» یا «ئەوا»، «خوارد» ئەوێتە «ئەخوا» ـ واژەی «خوارد» دوای لابردن «رد»، چون خوەی ئەلفی هەس، ئیتر لە دەرەو ئەلفی بۆ نایرن ـ «شمارد»، «شۆرد»، «مرد» لەم دەسوورە[3] بەدەرن، چون ئەگەر «رد»یان لیٚ لاوەین لە تەك نشانەی نەبگردنا (ئە) ئەون بە: «ئەشما»، «ئەشوا»، «ئەما». «ئەشما» و «ئەشوا» گوزاەیکیان نیە، «ئەما»یچ چەپەوانەی «ئەمریە»یە، پەس تەنیا «دال»ەکە لائەوەین، جیەی «ئەلف»یچ، «ی»ی سوك دائەنێن. ئەونە: «ئەشماریٚ»، «ئەشۆریٚ»، «ئەمریٚ». یا بە دەسوور گۆڕیان نووکەگەل ئەوێتە «ئەشمێریٚ».

ئەگەر دوای واژەی بگردگ «ان» بێت، تەنیا «ئەلف» لائەوەین، نشانەی نەبگردن کە «ئەلف»ە ئەنینە بەردەمیەو ئەوێتە نەبگردگ، وەك: «خۆران»، «باران»، «شێوان»، دوای لابردن «ئەلف»ەکان و دانیان نشانەی نەبگردن لە بەردەمیانەو، ئەونە: «ئەخۆرنیٚ»، «ئەبارنیٚ»، «ئەشێونیٚ».

---

١ـ ریشە: اصل.

٢ـ وەچە: فرع.

٣ـ دەسوور: یاسا.

کردار نەبگردگ ئەگەر پەیوەس بێ، نشانەی نەبگردن ئەنرگێتە سەر تیکەی دواگین، وەك: «هەڵسا»← «هەڵئەسێ»، «دانیشت»← «دائەنیشێ»، «سەر بەرەوخوارەو بوو.»← «سەربەرەوخوارەو ئەوێ».

**واژەی کردار نەبگردگیچ شەشە:**

**١. بوێژ: ئەنووسم.**

**٢. بوێژگەل: ئەنووسین.**

**٣. بژنەو: ئەنووسیت.**

**٤. بژنەوگەل: ئەنووسن.**

**٥. کەس‌تر: ئەنووسێ.**

**٦. کەس‌ترگەل /کەسگەل تر/: ئەنووسن.**

## «فەرمان [و] قەدەخە»

واژەی فەرمان[1] و قەدەخە[2] لە کردار نەبگردگ دوروس ئەون. نشانەی نەبگردن ـ کە «ئە،ێ» یا «ئە،ا» بێ ـ لە بەرودوای واژەی نەبگردگەو لائەوەین، لەجێگەیانا «ب، ە» ـ کە نشانەی فەرمانن ـ دائەنین، ئەوێتە واژەی فەرمان، وەك: «ئەکەفێ» «ئەخەفێ» «ئەفرۆشێ» «ئەنووسێ» «ئەبارنێ» «ئەوێ» «ئەکا». دوای لابردن «ئە،ێ» یا «ئە،ا» لە بەرودوایانەو و دانیان «ب، ە» لە جێگەیانا، ئەون بە: «بکەفە!» «بخەفە!» «بفرۆشە!» «بنووسە!» «ببارنە!» «بوە!» «بکە!».

ئەگەر جیەی «ب،ە» «م،ە» دانین، ئەوێتە واژەی «قەدەخە» [وەك:] «مەکەفە!» «مەخەفە!» «مەفرۆشە!» «مەنووسە!» «مەبارنە!» «مەوە!» «مەکە!».

**فەرمان و قەدەخە دوو جۆرن:**

١ـ فەرمان بژنەو[3]: بڕۆ! ٢ـ فەرمان کەس‌تر[4]: بڕوێ!

١ـ قەدەخەی بژنەو: مەڕۆ! ٢ـ قەدەخەی کەس‌تر: نەڕوێ!

**فەرمان و قەدەخە هەر کام دوو واژەیان هەس:**

١ـ تەنیا[1]: بڕۆ!، مەڕۆ!

---

١ـ فەرمان: امر.

٢ـ قەدەخە: نهی.

٣ـ بژنەو: مخاطب.

۴ـ کەس‌تر: غایب.

۲ـ گەل[2]: بڕۆن!، مەڕۆن!

## «ناو بکەر»

ناو بکەر[3] لە ناو کار یەکلایی دورووس ئەوێت[بەم جۆرە]: «یان» کە نشانەی کـار یەکلاییـە لـە دوایەو لا ئەوەین، «ب» کـە نـشانەی بکـەرە لـە بەردەمیـەو دائـەنین، ئەوێتـە واژەی بکـەر، وەك: «نووسیان»، «کۆشیان»، «کریان»، «خەفیان»، «بڕیان»، «دڕیان»، «خۆریان». دوای لابردن «یـان» لە دوای گشتیانەو و دانیانی «ب» لـە بەردەمیانـەو ئـەون بـە: «بنـووس»، «بکـۆش»، «بکـەر»، «بخەف»، «ببڕ»، «بخوەر». گشت ئەمانە ناو بکەرن.

گایێ نـشانە لەسـەر بکـەرەو لائـەوەن، ئەیـژن: «خـوەر»، «دڕ»، «بـڕ»، «خـەف»، «کـەر»، «کۆش»، «نووس»، [وەك:] «ناخوەر»، «بەرگدڕ»، «داربڕ»، «فیێلْخەف»، «کارکەر»، «فرەکۆش»، «خوەشنووس یا نویس»

ناو بکەر لە کارگەل یەکلاییا کە دواییان بە «یان» نیە، دەسوور دورووسـیێ بـە دەس نـەهاتگـە، وەك: «بوون»، «رویـن»، «هـاتن». واژەی بکـەر لـەم جـۆرە کارگـەلا بەسـسە بـە ژنەفتنـە، وەك: «هەس»، «رەوەن»، «ئاێن».

## «ناو کریاگ»

ناو کریاگیچ[4] هەر لە کار یەکلایی دورووس ئەویێ [بەم جۆرە:] «ن» کە نشانەی کـارە لـە دوایـەو لائەوەین، «گ»ئەنینە جیێگەی، ئەوێتـە واژەی کریـاگ، وەك: «دۆشـیان»، «نووسـیان»، «بریـان»، «دڕیان»، «خۆریان». دوای لابردن «نون» و دانیان «گـاف» لـە جیێگـەیانا ئـەون بـە: «دۆشـیاگ»، «نووسیاگ»، «بڕیاگ»، «دڕیاگ»، «خۆریاگ».

## «یەکلاوەکردن کار دوولایی»

ئەگەر گەرەکمان بیێ لە کارگەل دوولایی کار یەکلا دورووس بکەین، «ین» یا «دن» یا «اْنـن» ــ کە نشانەی دوولایین ـ لائەوەین، «یان» ـ کە نشانەی یەکلاییە ـ ئەنینە جیێگەی، ئەوێتـە یـەکلایی. یانیێ ئەگەر کار دوولایی بە «ین» دوایی هاتویێ، «ئەلف» ئەنینە جیێگـەی، ئەوێتـە یـەکلایی، وەك:

---

۵ـ تەنیا: مفرد.

۶ـ گەل: جمع.

۱ـ ناو بکەر: اسم فاعل.

۲ـ ناو کریاگ: اسم مفعول.

«درِین»، «برِین»، «نووسین»، «دۆشین»... ئەلفێ ئەنینە ناو دۆژ[١] «ی» و «ن»ەکە، ئەوێتە: «درِیان»، «برِیان»، «ترسیان»، «نووسیان»، «دۆشیان». یا ئەگەر بە «دن» دوایی هاتگە، «دال»ەکە لائەوەین، لە جێگەیا «یا» دائەنین، ئەوێتە یەکلایی، وەك: «کردن»، «بردن»، «هاوردن»، «شماردن». دوای لابردن «د» و دانیان «یا» لە جێگەیا، ئەوْن بە: «کریان»، «بریان»، «هاوریان»، «شماریان»، یا بە دەسوور گۆڕان نووکەگەل: «شمێریان».

ئەگەر بە «انێ» دوایی هاتگە، یەکێ لە «نون»ەکان لائەوەین، ئەگەر خوەی «ی»ی نەوێ، لەبەر «ئەلف»ەکەوە«ی» دائەنین، ئەوێتە یەکلایی، وەك: «خۆرانێ»، «پژانێ»، «مرانێ»، «بارانێ». دوای لابردن یەکێ لە «نون»ەکان و دانیان «ی» لەبەر ئەلفەکەوە، ئەون بە: «خۆریان»، «پژیان»، «مریان»، «باریان». «مردن» لەم دەسوورە بەدەرە. «شیانێ» و «ژیانێ» چونکە خوەیان «ی»یان هەس، دوای لابردن یەکێ لە «نون»ەکان، ئیتر ئەوەجەی هاوردن «ی»مان نیە، خوەیان ئەون بە: «شیان»، «ژیان».

«تن» هەم نشانەی یەکلاییە، وەك: «خەفتن»، «کەفتن»، هەم نشانەی دوولاییە، وەك: «خستن»، «فرۆتن»، «کروتن». هەرگا کار دوولایی بە «تن» دوایی هاتوێ بە دەسوور «دن» رەفتار ئەکرگێ، یانێ: دوای لابردن «د» لە جێگەیا «یا» دائەنین، ئەوێتە یەکلایی وەك: «فرۆشتن»، «کرۆژتن». کە ئەوێتە: «فرۆشیان»،«کرۆژیان». بۆ کورتی «ش»ی «فرۆشتن» و «ژ»ی «کرۆژتن» پەرت ئەکرگێ، ئەیژن: «فرۆتن»، «کروتن».

«خستن» بە دەسوور ئەوێتە: «خسیان» وەلێ بە دەسوور گۆڕیان نوکەگەل بووگە بە: «خریان».

## «واژە بکردگگەل و نەبکردگ و فەرمان»

| بکردگ رووت | بکردگ ناپاوەجێ | بکردگ دوور | بکردگ دوورتر | بکردگ نەزیك | نەبکردگ | فەرمان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| بوو | بووویێ | بووگە | بووو | ئەبوو= ئەوو | ئەوێ | بوە! |
| رْوی | رِویوێ | رِویگە | رِویوْو | ئەڕوی | ئەڕوێ | بڕوە!= بڕۆ! |
| هات | هاتوێ | هاتگە | هاتوْو | ئەهات | ئەتێ = تێ | بێ! |
| خەفت | خەفتوێ | خەفتگە | خەفتوْو | ئەخەفت | ئەخەفێ | بخەفە! |
| کەفت | کەفتوێ | کەفتگە | کەفتوْو | ئەکەفت | ئەکەفێ | بکەفە! |
| کرد | کردوێ | کردگە | کردْوو | ئەکرد | ئەکا | بکە! |
| خەفان | خەفانوێ | خەفانگە | خەفانْوو | ئەخەفان | ئەخەفنێ | بخەفنە! |
| هێشت | هێشتوێ | هێشتگە | هێشتوْو | ئەهێشت | ئەیلێ= ئەتلێ | بلاّ!، بلاّنە!، بتلە!، بێلاّ!، بێلاّنە! |
| ژیا | ژیاوێ | ژیاگە | ژیاوو | ئەژیا | ئەژی | بژی! |

---

٣ـ دۆژ: مابین.

### «واژەگەل بگردک»

| بویژ | بویژگەل | بژنەو | بژنەوگەل | کەس‌تر | کەس‌ترگەل |
|---|---|---|---|---|---|
| رْویم | رْوین | رْویت | رْوین | رْوی | رْوین |
| نووسیم | نووسیمان | نووسیت | نووسیتان | نووسی | نووسیان |

### «واژەگەل نەبرگردک»

| بویژ | بویژگەل | بژنەو | بژنەوگەل | کەس‌تر | کەس‌ترگەل |
|---|---|---|---|---|---|
| ئەرِوم | ئەرِوین | ئەرِویت | ئەرِون | ئەرِویٚ | ئەرِون |
| ئەنووسم | ئەنووسین | ئەنووسیت | ئەنووسن | ئەنووسیٚ | ئەنووسن |

### «کردار بیٚ بکمر[1]»

| بویژ | بویژگەل | بژنەو | بژنەوگەل | کەس‌تر | کەس‌ترگەل |
|---|---|---|---|---|---|
| کوژیام | کوژیاین | کوژیایت | کوژیان | کوژیا | کوژیان |
| بریام | بریاین | بریایت | بریان | بریا | بریان |

## واژەزانی[2]

### «قسە»

قسە[3]، یانیٚ دوین و گالّە کردن، وتان لـە واژە[4] دوروس ئـەویٚ. بـۆ گـەیانـْن نیـاز دلّ چـەن واژە ئەدەنە تەمووی یەکەو ئەویٚتە قسە. قسە کەمتر لە یەك پارچە[5] نیـە. پارچـەیچ کـەمتر لـە دوو واژە ناویٚ. پارچە ئەوەسە بژنەو گویٚداری چتیٚ تر نـەکا. یـانیٚ دوایـی هـاتویٚ. وەك: رۆسـەم رْوی. زۆراو خاس پـیاگیٚکە.

---

١ـ کردار بیٚ بکمر: فعل مجهول.

٢ـ واژدزانی: علم نحو.

٣ـ قسە: کلام.

٤ـ واژە: کلمە، لفظ.

٥ـ پارچە: جملە.

## «واژە»

واژە وتمان لە نووکە[1] دورووس ئەوێت. چەن نووکە ئەدەنە پاڵ یەکەو ئەوێتە واژە.

**واژە سێ جۆرە:**

١ـ ئەگەر تەنیا خوەی گوزارەی دورووسێکی هەس و یەکێ لە ساگەلی لە تەکا نیە (ئەوسا، ئیسا، لەمەوسا) ئەوە پیئەیژن ناو[2]، وەك: ڕۆسەم، گوودەرز، میز، مەڕمەڕ، نەرگس، مەلیچك، چنار، ئەسپ.

٢ـ ئەگەر تەنیا خوەی گوزارەی دورووسێکی هەس و یەکێ لەساگەلیچی لە تەکا هەس، ئەوە پیئەیژن کردار[3]، وەك: ڕۆی، رویگە، ئەڕوێ، برپیا، برۆ!، مەڕۆ!

٣ـ ئەگەر تەنیا خوەی گوزارەی دورووسێکی نیە و سایچی لە تەکا نیە، ئەوە پیئەیژن پێتەك[4]، وەك: بە، نە، لە.

## «سا»

**سا[5]، یانێ ڕۆزگار، سێ جۆرە:**

١ـ یا لەمەوبەر بگردگە، ئەوە پیئەیژن: ئەوسا[6].

٢ـ یا نەبگردگە و ئیسە هاین تیا، ئەوە پیئەیژن: ئیسا[7].

٣ـ یا لەمەودوا تێ، ئەوە پیئەیژن: لەمەوسا[8].

## «ناو»

ناو وتمان واژەیکە دانریاگ بۆ گوزارە، بێ ئەمە سایکی لە تەکا بوێ.

**ناو لە سەبارەت واژەوە دوو جۆرە:**

* یا لەیەك واژە دورووس بووگە، ئەوە پیئەیژن: ناو سادە[9]، وەك: ئەحمەد، کتێو، قورسی. بولبوڵ.
* یا لە چەن واژە دورووس بووگە: ئەوە پیئەیژن: ناو پەیوەس[1]، وەك: خوایار، چەرمەنگ سوار،

---

١ـ نووکە: حرف.

٢ـ ناو: اسم.

٣ـ کردار: فعل.

٤ـ پێتەك: حرف، فضلە.

٥ـ سا: وەخت، کات.

٦ـ ئەوسا: ماضی.

٧ـ ئیسا: حال.

٨ـ لەمەوسا: استقبال.

٩ـ ناو سادە: اسم بسیط.

کوردسان، گولاو.

**هەرکام لەم دوو جۆریچە لە سەبارەت گوزارەوە، ئەونە چەن جۆر تر، بەم ڕێزە:**

١. ناو تەن. ٢. ناو گەل. ٣. ناو جۆر. ٤. ناو تورۆم. ٥. ناو سا. ٦. ناو جێگە. ٧. ناو دەنگ. ٨. ناو ڕەنگ. ٩. ناو شمارە. ١٠. ناو نشـــانە. ١١. ناو کار. ١٢. ناو بکـەر. ١٣. نـاو کـــرياگ. ١٤. ناو کاردار. ١٥. ناو نشاندار. ١٦. ناو کێشەك يا درکە.

**هەر کام لەمانيچە دوو جۆرن: يا ئەشناسە يا نەشناسە.**

١ـ ناو ئەگەر بۆ ناسين يەك چت دانرياگە، ئەوە پیئەيژن: ناو تەن[٢]. ئەو چـتە ئەگـەر ئـادەميزاد بیٚ، ئەيژن: کەس. وەك: تاران، کوچکەڕەش، فەلاٚمەرز، ڕۆسەم.

٢ـ ئەگەر بۆ ناسين چەن چت دانرياگە، ئەويچ چەن جۆرە:

♣ يا بۆ چەن تەن يا چەن کەس دانرياگە، ئەوە پیئەيژن: ناو گەل[٣]. وەك: دەسـە، جـووق، گـەل، پۆلٚك، گەلە، گورۆ.

♣ يا بۆ يەك جۆر دانرياگە، يانیٚ بۆ برێك لـە يـەك تـورۆم، ئـەوە پـیئەيـژن نـاو جـۆر[٤]. وەك: ئادەميزاد، ئەسپ، وشتر، چنار، قالاٚو، مەڕمەڕ.

♣ يا بۆ يەك تورۆم دانرياگە، ئەوە پیئەيژن: ناو تـورۆم[٥]. وەك: کوچـــك، بنـچك، گيانـدار، هەسارە، ئاگر. (ناو جۆر و ناو تورۆم بەسەر يەکێکيچا ئەبرگیٚ، بە سەر گشتيچا ئـەبرگیٚ، يـانیٚ بـە تەواو تورۆم ئەسپ ئەيژن: ئەسپ. بە يەك ئەسپيچ ئەيژن: ئەسپ. بە تەواو دارگەل دنيا ئەيژن: دار، بە يەك دانە داريچ ئەيژن: دار).

٣ـ يا ناو بۆ ناسين وەخت و ڕۆژگار دانرياگە، ئەوە پیئەيـژن نـاو سـا[٦]. وەك: ئـەمرۆژ، سـۆزی، دويێکە، شەمە، جمعە، شەو، ڕۆژ، حەفتە، مانگ، ساڵ، ئەوسا، ئيسا، لەمەوسا.

٤ـ يا بۆ ناسين جێگە و مەڵوەن دانرياگە، ئەوە پیئەيژن ناو جێگە[٧]. وەك: ئێران، ئاڵمان، تـاران، کوردسان، مارنج، مووژەژ، بان، هەوش، دالاٚن، هێشخان، جەنگگا، سەورگا، گەوڕ، گەلەخان.

---

١٠ـ ناو پەيوەس: اسم مرکب.

١ـ ناو تەن: اسم شخص.

٢ـ ناو گەل: اسم جمع.

٣ـ ناو جۆر: اسم نوع.

٤ـ ناو تورۆم: اسم جنس.

٥ـ ناو سا: اسم زمان.

٦ـ ناو جێگە: اسم مکان.

٥ـ یا بۆ ناسین دەنگ دانریاگە، ئەوە پیئەیژن: ناو دەنگ[1]. وەك: بارە، بۆڕە، قاژە، قیژە، گرمە، زرمە، نووزە، سروە، دەشتی، رەشتی، هۆڕە، مۆڕە، بەیات، ماهوور.

٦ـ یا بۆ ناسین ڕەنگ دانریاگە، ئەوە پیئەیژن: ناو ڕەنگ[2]، وەك: سوور، سەوز، زەرد، شاوی، بەنەوش، چێرەیی، بسەیی، قاوەیی.

٧ـ یا بۆ ناسین شمارە دانریاگە، ئەوە پیئەیژن: ناو شمارە[3]، وەك: یەك، دوو، دە، بیس، سی، سەد، هەزار، دوو هەزار، پانسەد و چل و پەنج، نیم، نیمە، یەکم، دوەم، پەنجەمین، شانزەمین، سێیەك، دەیەك، سەدیەك.

٨ـ یا بۆ ناسین نشانە دانریاگە، ئەوە پیئەیژن: ناو نشانە[4]، وەك: پانی، درێژی، کوتایی، بەرزی، نزمی، دووری، نەزیکی، خاسی، خراوی، گەرمی، سەردی، زرنگی، گێلی، زەردی، سووری.

٩ـ یا بۆ ناسین مەزە دانریاگە، ئەوە پیئەیژن: ناو مەزە[5]، وەك: تالّی، تورشی، سۆلّی.

١٠ـ یا بۆ ناسین کار دانریاگە، ئەوە پیئەیژن: ناو کار[6]، وەك: ڕۆیین، هاتن، تاشین، دۆشین، نۆشین، کڕانن.

**نشانەی ناو کار چەن چتە:**

ـ «ن»، /وەك:/بوون، چوون.

ـ «دن»، /وەك:/کردن، بردن، شاردن.

ـ «تن»، /وەك:/خەفتن، کەفتن، فرۆشتن.

ـ «یان»[7]، /وەك:/بریان، گریان، شاریان.

ـ «انن»[8]، /وەك:/کڕانن، خۆرانن، پژانن.

١١ـ یا ناو بۆ ناسین بکەر دانریاگە، یانێ کارکەر، ئەوە پیئەیژن: ناو بکەر[9]، وەك: تاشن، ڕەوەن، بکوژ، ببڕ، بسێن، بفرۆش.

---

٧ـ ناو دەنگ: اسم صوت.

١ـ ناو ڕەنگ: اسم لون.

٢ـ ناو شمارە: اسم عدد.

٣ـ ناو نشانە: اسم صفت.

٤ـ ناو مەزە: اسم طعم.

٥ـ ناو کار: اسم مصدر.

٦ـ علامت مصدر لازم است.[نشانەی کار یەکلاییە.]

٧ـ علامت مصدر متعدی است.[نشانەی کار دوولاییە.]

٨ـ ناو بکەر: اسم فاعل.

١٢ـ یا بۆ ناسین کریاگ دانریاگە، یانێ کارێ کە کریاوێ، ئەوە پێ‌ئەیژن: ناو کریاگ[1]، وەك: کوژیاگ، بڕیاگ، سنیاگ، فرۆشیاگ، تاسیاگ. ڕْویگ، هاتگ.

١٣ـ یا بۆ ناسین کاردار دانریاگە، ئەوە پێ‌ئەیژن: ناو کاردار[2]، وەك: ئاودار، قلیاندار، کەوشدار، ئاویار، میرئاخور، وەرزێر، ئاسیاوان، ئاشپەز، ئاوپاش، کۆپاندۆز، گوناکار، خوەنەوار، ئەژنەوا، ئاسنگەر، چیلانگەر، باهۆش، مۆچیاریکەر. گرینۆك.

١٤ـ یا بۆ ناسین نشاندار دانریاگە، ئەوە پێ‌ئەیژن: ناو نشاندار[3]، وەك: درێژ، کۆتا، بووچك، گەورە، پان، گوشاد، دوور، نەزیك، گەرم، سەرد، تاریك، ڕۆشن، زیرەك، گێل، ئاسان، ئالۆز، زەرد، سوور.

١٥ـ یا بۆ ناسین گوزارە دانریاگە، ئەوە پێ‌ئەیژن: ناو گوزارە[4]، وەك: هۆش، زانست، جەنگ، ئاشتی، برسیەتی، تینْگی، ئارەزوو. (ناو نشانەگەل فرەیان ناو گوزارەن).

١٦ـ یا بۆ نشاندان چتگەلێ دانریاگە کە ناویان نابرگێ، ئەوە پێ‌ئەیژن: ناو کێشەك[5] یا ناو درکە[6]، وەك: من، تۆ، ئێمە، ئێوە، ئەو، ئەوان. ئەم، ئەمان، ئەمە، ئەوە، ئەمانە، ئەوانە.

**کێشەك یا درکە دوو جۆرن:**

- یا ناوە،/ئەوە/ پێ‌ئەیژن: کێشەك نەلکیاگ[7]، وەك ئەوانە یا لەبەردەمەو وتمان.
- یا پێتەکە، ئەوە پێ‌ئەیژن: کێشەك لکیاگ[8]، ئەویچ دوو جۆرە:

١. یا بە کردارەو ئەلکێ، وەك: ئەڕۆم، ئەڕوین، ئەڕویت، ئەڕۆن، ئەڕوێ، ئەڕۆن.

٢. یا بە کرداریچەو و بەناویچەو ئەلکێت، وەك: فرۆتم، فرۆتمان، فرۆتت، فرۆتتان. فرۆتی، فرۆتیان. مالم، مالمان، مالت، مالتان، مالی، مالیان.

١٧ـ یا ناو بۆ نشاندان چتگەلێ دانریاگە کە ناویان نازانرگێ، ئەوە پێ‌ئەیژن: ناو گوتگ[9]، وەك: کەم، فرە، گشت، پاك، هیچ، فلان، فیسار، هەر کەس، هیچکەس، هیچکام.

---

٩ـ ناو کریاگ: اسم مفعول.

١ـ ناو کاردار: صیغە مبالغە.

٢ـ ناو نشاندار: صفت مشبهە.

٣ـ ناو گوزارە: اسم معنی.

٤ـ ناو کێشەك: اسم ضمیر.

٥ـ ناو درکە: اسم اشارە.

٦ـ کێشەك نەلکیاگ: ضمیر منفصل.

٧ـ کێشەك لکیاگ: ضمیر متصل.

٨ـ ناو گوتگ: اسم کنایە.

## «ئەشناس [و] نەشناس»

ناو ـ خوا سادە بیٚ یاپەیوەس ـ دوو جۆرە:

١ـ ئەگەر بۆ یەك چت شناسیاگ دانریاگە، ئەوە پیەیژن: ئەشناس[1]، وەك: ئەحمەد، مەحموود، رۆسەم، تاران، ئەسفەهان.

٢ـ ئەگەر بۆ یەك چت نەشناسیاگ دانریاگە، ئەوە پیەیژن: نەشناس[2]، وەك ئەیژی: پیاگێك رۆی، کوریٚ هات، چوومە شاریٚ.

«ی» و «ێك» نشانەی نەشناسە، ئەگەر گەرەکمان بیٚ نەشناس بکەینە ئەشناس یا «کە» کە نشانەی شناساییە لە دوایەو دائەنین ئەوێتە ئەشناس، وەك ئەیژی: پیاگەکە رۆی، کورەکە هات. یا ناو کێشەك لە بەردەمیەو یا لە دوایەو دائەنین ئەوێتە ئەشناس، وەك ئەیژی: ئەم پیاگە، ئەو کورە. پیاگ من، کور تۆ.

## «جێوارگەل[3] ناو»

**ناو بە چەن جۆر ئەگۆرگیٚ:**

- گاییٚ ئەویٚ بە بکەر، [وەك:] رۆسەم هات، زۆراو رۆی.
- گاییٚ ئەویٚ بە کریاگ، [وەك:] ئەحمەد کوژیا، سوار ئەسپ بووم.
- گاییٚ ئەویٚ بە پێکەر[4]، [وەك:] بە چێو دایان لیٚم، بە کەلەك بردمیان.
- گاییٚ ئەوێتە نشانەکار[5]، [وەك:] دام لیٚ لیٚدانیٚ خراو، کوشتم کوشتنیٚ تەواو.
- گاییٚ ئەوێتە نشانەبکەر[6]، [وەك:] ریویە رەشەکە رایکرد، کورە خاسەکە هات.
- گاییٚ ئەوێتە نشانەکریاگ[7]، [وەك:] ئەسپە کوێتەکەم فروٚت، پیاگە بالابەرزەکەم بانگکرد.
- گاییٚ ئەوێتە جێگەی کار[8]، [وەك:] لە بانەو خەفتم، لە مەدرەسەدا ئەخوێنم.
- گاییٚ ئەوێتە سای کار[9]، [وەك:] دویکە رویم، شەو خەفتم، لە پێرەکەوە هاتگم.

---

١ـ ئەشناس: معرفە.

٢ـ نەشناس: نکرە.

٣ـ جێوارگەل: اوضاع، احوال (جیوار: وضع، حالت)

٤ـ پێکەر: مفعول بە.

٥ـ نشانەکار: مفعول مطلق.

٦ـ نشانەبکەر: صفت فاعل.

٧ـ نشانەکریاگ: صفت مفعول.

٨ـ جێگەی کار: ظرف مکان.

٩ـ سای کار: ظرف زمان.

◆ گایێ ئەوێتە چەمك[1]، [وەك:] ڕۆسەم خوەی هات، منالەکان گشتیان هەلووکان ئەکەن.

◆ گایێ ئەوێتە قاولێکریاگ[2]، [وەك:] ئەی خوا لە دەس ئەم ڕۆزگارەو!، ئەهای باخەوان!

◆ گایێ ئەوێتە جێوار[3]، [وەك:] بە سواری هاتم، بە کەنینەو وتم پێ.

◆ گایێ ئەوێتە خدبیەدریاگ[4]، [وەك:] ئەسپم نیە، کوڕم نیاگەسە خوەنن، ئەسپ مـن خاسـە، کوڕ تۆ زرنگە.

◆ گایێ ئەوێتە خدبیەلادریاگ[5]، [وەك] ڕەخش ڕۆسەم، کردارْ ئەحمەد، شێوەکێشی زۆراو.

◆ گایێ ئەوێتە پێتەك[6]، یـانێ خـوەی تـەنیا گـوزارەی دوروسـێکی نیـە، هەمیـشە گـوزارەی تەکخریاگی هەس، [وەك:] خنج و منج، کاڵ و کنج، سوور و سنج، گەوج و لـەوج، قـورس و قـووڵ، گورج و گۆڵ، سفت و سۆڵ، چۆڵ و هۆڵ، شل و شۆڵ، تەڕ و تۆڵ، فش و فۆڵ، سەرد و سـڕ، شـل و ول. هەمیشە، پێتەك ها لە دوای تەکخریاگەو، بەڵام گایێ ئەکەفێتە بەرەو، وەك: پـت و پیـارزگ، مت و موورگ. ئەم جۆرە پێتەککەلە ژێرچەمیچیان پی‌ئەیژن، ژێرچەم لە کوردیا بۆ شـیرینی گاڵـەس. نووکەی بەرگ هەر ناوێ یا...[7] بکەین بە «میم» ئەوێ بە ژێرچەم، [وەك:] سـێف و مێـف، قـاڵی و ماڵی، هاتن و ماتن.

ئەگەر نووکەی بەرگی ناو تەکخریاگ «میم» بێت، «چت» ئەوێتە ژێرچەم، [وەك:] مـار و چـت، موورگ و چت، مەویژ و چت.

## «کردار»

کردار[8] وتمان واژەیکە [کە] تەنیا خوەی گوزارەی دوروسی هەس و سایـچی هـا لـە تـەکا، وەك: ڕْوی ئەڕوێ. هەناردی، ئەنێرێ. بڕۆ!، مەڕۆ!

لە تەك کردارا ـ بێجگە لە کار ـ هەمیشە تاپۆی[9] تر هەس کە لە واژەدا دیار نیە. ئەیژی: ڕْوی، یانێ: فلان کەس ڕْوی. ئەڕوێ، یانێ: فلان کەس ئەڕوێ.

---

١ـ چەمك: تفسیر، توضیح.

٢ـ قاولێکریاگ: مُنادی.

٣ـ جیوار: حال.

٤ـ خدبیەدریاگ: مضاف.

٥ـ خدبیەلادریاگ: مضاف الیه.

٦ـ پێتەك: ردف.

٧ـ ئەم وشەیە لە دەسنووسەکەدا ناخوێنرێتەوە، لەوانەیە «یا کارێ» بێت. (ر ـ ر)

٨ـ کردار: فعل.

٩ـ تاپۆ: مضمر.

☜ برِێ کردارگەل هەن، یەك تاپۆیان ها لە تەکا، ئەوە پـێـئەیـژن کـردار یـەکلایی[1]، وەك: رْوی، خەفت، شکیا. یانیٚ: فلاّن کەس رْوی، فلاّن کەس خەفت، فلاّن چت شکیا.

☜ برِێ کردارگەلی تر هەن دوو تاپۆیان هەس لە تەکا، ئەوانـە پیـان ئەیـژن: کـردار دوولایـی[2]، وەك: کوشتی، شکانی. یانیٚ: فلاّن کەس فلاّن کەسی کوشت، فلاّن کەس فلاّن چتی شکان.

☜ برِێ کردارگەل تر هەن بێجگە لە کار و تاپۆ، ئەوزار[3] کـاریچ نـشان ئـەدا، وەك: سـووتانی، سەری بری، خنکانی، کونای کرد. یانیٚ: فلاّن کەس فلاّن چتی بە ئاگر سووتان، فلاّن کەس فلاّن چـتی بە چتیٚ تر (وەك چەقۆ) سەر بری، فلاّن کەس فلاّن گیانداری بە دەس یا بە پـەت خەفـە کـرد، فـلاّن کەس فلاّن چتی بە چتیٚ نووکدار (وەك سمە) کونا کرد.

ئەمانە پیانئەیژن: «کردار ئەوزاری». کردار ئەورازی لە یەکلاییـــچا هەس، [وەك:] سووتیا، خنکیا.

بۆ ناسین ئەم تاپۆگەلە، یانیٚ بۆ شناسایی ئەم سێ چتە کە هان لە زگ کردارگەلا، تین یەکە یەکە ناو لە بەرابەریانەو دائەنین، بەم جۆرە: تاپۆی یەکم ناو ئەنینە: رۆسەم، تاپۆی دوەم ناو ئەنینە: مـامر، تاپۆی سیەم ناو ئەنینە: چەقۆ. ئەیژین: رۆسـەم مـامری بـە چـەقۆ سـەربری. تـاپۆی یـەکم ئـەوینین بکەرە[4]، یانیٚ سەربڕە. تاپۆی دوەم کریاگە[5]، یانیٚ سەربریاگە. تاپۆی سیەم پێکـەرە[6]. ئێمـەیچ هـەر بەم جۆرە ناویان ئەوەین. «ی» نشانەی کریاگە، «بە» نشانەی پێکەرە.

یاسای واژەزانی ئەمەسە کە هەمیشە کردار لە دوای ئەم تاپۆگـەلۆ بـێ. گـایێ ئەگـەر بـەرودوا بکەفن لە یاسای واژەزانی بەدەرە. وەك ئەمە بیٚژی: رۆسەمی گۆدەرز سەربری بـە چـەقۆ. یـا بیـّژی: رۆسەمی سەربری گۆدەرز بە چەقۆ. بە بوٚنەی نشانەکانۆ گوزارە ناشـێوگێ، بـەلاّم واژەزان بـەم جـۆرە قسە ناکا.

پێکەر کەمتر لە قســەدا ئــەویٚژگێ، فــرەتر بـکەر و کـــریاگ نـاو ئـەبرگێ، [وەك:] رۆســەم زۆراوی کوشت، زۆراو چەناکەی هەڵتەکان، ئەحە لێفەکەی سووتان.

کردار یەکلایی یا تەنیا بکەری لە تەکا ئەویٚژگێ (یانیٚ تاپۆی یەکم)، وەك ئەیژی: ئەحمـەد رْوی، مەحموود هات. یا بەسەی[7] کرداریچی لە تەکا ئەیـژن، وەك ئەمـە ئەیـژی: ئەحمـەد رْوی بـۆ بـازار، ئەحمەد ئەروێتە بازار. یەخەکە بوو بە ئاو، یەخەکە ئەوێتە ئاو.

---

١ـ کردار یەکلایی: فعل لازم.

٢ـ کردار دوولایی: فعل متعدی.

٣ـ ئەوزار: آلت.

٤ـ بکەر: فاعل.

٥ـ کریاگ: مفعول.

٦ـ پێکەر: مفعول.

٧ـ بەسەی کردار: قید فعل.

کردار یەکلایی بێ کریاگە، یانێ هەرگیز کریاگی نیە لە تەکا، چون یەك تاپۆی هەس [وەك:] ئەحمەدِ روی، مەحموودِ هات.

## «کردار بێبکەر»

برێ لە کردارگەل هەن، با ئەمە تاپۆی بکەریان ها تیا، وەلێ لە تەکیانا بکەر ناوێژگێت. ئەوانە پیان ئەیژن: کردار بێبکەر[1]. وەك ئەیژی: رۆسەم کوژیا، قەڵەمەکە شکیا.
لەتەك کردار بێبکەرا تەنیا کریاگ ئەوێژگێ. کردار بێبکەر لە کردار دوولایی دوروس ئەوێ، [وەك:] «کوژیا» لە «کوژیان»، «شکیا» لە «شکیان».

## «پارچە»

پارچە[2] وتمان تیکەیکە لە قسە. نشانەیچی ئەوەسە [کە] بژنەو دوای دوایی‌هاتنی، ئیتر گوێداری چتێ تر نەکا، وەك: رۆسەم رۆی.
پارچە دوو جۆرە، یا کرداریە[3] یا ناوی[4]. پارچەی کرداری لە دوو واژە کەمتر دوروس ناوێ (ناو+ کردار) [وەك:] زۆراو هات، رۆسەم رۆی.
پارچەی ناوی لە سێ واژە کەمتر دوروس ناوێ (دوو ناو+ یەك پێتەك) [وەك:] رۆسەم خاسە. «رۆسەم» یەك. «خاس» دوو. «ە» سێ. «ە» پێ‌ئەیژن: «پێتەك واژەبەسی»، «خاس» ئەوەسێ بە «رۆسەم»ەو.
بۆ ئەمە بزانین قسەیك یا باسێ چەن پارچەی کوردی[5] هاتیا، هەرچە کردارە لەو باسا ئەشمێرین، هەرچەن بوو، ئەوە شمارەی پارچەگەلە، بۆ نموونە ئەیژین: «ئیمرۆ <u>رویمە</u> بازار، ئەسپێکم <u>سەن</u>، <u>هاتمەو</u> ماڵەو، کەمێ <u>خەفتم</u>، دوای ئەوە <u>هەڵسام</u>، <u>چووم</u> بۆ مەدرەسە، دەرسم <u>خوێن</u>» کردارگەل ئەم قسە حەفتن، ئەزانین ئەم قسە حەفت پارچەس.

---

١ـ کردار بێبکەر: فعل مجهول.

٢ـ پارچە: جملە.

٣ـ کرداری: فعلیە.

٤ـ ناوی: اسمیە.

٥ـ لە دەستنووسەکەدا وەها نوسراوە، بەڵام لەوانەیە نووسەری بەرێز ویستبێتی بنووسێت: کرداری. (ر ـ ر)

## «پیتەك»

پیتەك وتمان واژەیکە خوەی تەنیا گوزارەی دوروسێکی نیـە، سایـچی لـە تـەکا نیـە، یـانیٚ تـا نەیخەیتە تەك واژەیك دوروس، بە تەنیا خوەی هیچ گوزارەیك ناداتە دەسەو.

**پیتەك چەن جوٚرە، بەم ڕیزە:**

- **پیتەك کار**[١]: «ن، دن، تن، انن، یا»/وەك: چوون، بگردن، خەفتن، پژانن، پژیان.
- **پیتەك کردار**[٢]: «م، ین، یت، ن، ی»/وەك: ئەڕوٚم، ئەڕوین، ئەڕویت، ئەڕوٚن، ئەڕویٚ، ئەڕوٚن.
- **پیتەك خدیە**[٣]: «م، مان، ت، تان، ی، یان»/وەك: ئەسپەکەم، ئەسـپەکەمان، ئەسـپەکەت، ئەسپەکەتان، ئەسپەکەی، ئەسپەکەیان.
- **پیتەك نەبگردگ**[٤]: «ئە»/وەك: ئەڕویٚ، ئەنووسیٚ.
- **پیتەك تەنیایی**[٥]: «ی، یٚ، یك»/وەك: پیاڵەی، ئەسپیٚ، ئەسپێك، پیاڵەیك.
- **پیتەك لەگەڵی**[6]: «و، چ، تەك، لەتەك»/وەك: ئەحەو مەحە هاتن، حەمـەیچ هـات، ئەحـە تەك مەحەدا هات، ئەحە لەتەك مەحەدا هات.
- **پیتەك مەرج**[٧]: «ئەگەر»/وەك: ئەگەر ئەیژی تا بڕوٚم. (پیتـەك مـەرج ئەگـەر بـچێتە سـەر کردار بگردگ، ئەیکاتە نەبگردگ: ئەگەر هات. یانی: ئەگەر بێت).
- **پیتەك ئەشناس**[٨]: «کە، کان، یا، ە»/وەك: ئەسپەکە، ئەسپەکان، ئەو کوڕە کە هات، ئـەو کوڕە یا هات، کەڕە هات.
- **پیتەك نەشناس**[٩]: «ی، یك، هەر»/وەك: ئەسپیٚ، ئەسپێك، هەرکەس.
- **پیتەك هاوگەری**[١٠]: «ی، گ، گین، گی، ین، ە، ەیی، ا»/وەك: تارانی، خواردەمەنی، بەرگ، بەرگین، مانـگی، یەگانەگی، ئاسنین، یەکساڵە، گەورەیی، پانا، درێژا.

---

١ـ پیتەك کار: علامت مصدر.

٢ـ پیتەك کردار: ضمیر فعل.

٣ـ پیتەك خدیە: ضمیر متصل بە اسم.

٤ـ پیتەك نەبگردگ: حرف مضارع.

٥ـ پیتەك تەنیایی: حرف وحدت.

٦ـ پیتەك لەگەڵی: حرف معیّت، عطف.

٧ـ پیتەك مەرج: حرف شرط.

٨ـ پیتەك ئەشناس: حرف تعریف.

٩ـ پیتەك نەشناس: حرف تنکیر.

١٠ـ پیتەك هاوگەری: حرف نسبت.

➢ **پیتەك پرسا**[1]: «چە، کەی، کێ، کام، بۆچە»/وەك:/ چە ئەیـژیت؟، کـەی ئـەڕویت؟، کـێ ئەڕوێ؟، کام ڕوین؟، بۆچە ئەڕوێ؟

➢ **پیتەك دووگومانی**[2]: «یا، یام، یان، شایەد، گۆیا»/وەك:/ ئەحمەد یا مەحموود، یام ڕۆسەم، یان گۆدەرز، کامیان هاتْون؟ شایەدا ئەحمەد هاتوێ، گۆیا ڕۆسەمیچ هاتوێ.

➢ **پیتەك چەڵتە**[3]: «وەلێ، بەڵام، بەڵان»/وەك:/ وەلێ ئەحمەد هات، بەڵام خـاس هـات، بـەڵان خاس هات.

➢ **پیتەك دوایی**[4]: «تا»/وەك:/ تا ئەسفەهان ڕْویم.

➢ **پیتەك بەرایی**[5]: «لە»/وەك:/ لە کوردسانەو ڕْویم.

➢ **پیتەك ترنگ**[6]: «تر، ترین»/وەك/ گەورەتر، درێژتر، گەورەترین. («تر» بۆ یەك ترنگە/وەك: /ئەم کەسە لەو کەسە خاسترە. «تـرین» ترنگێکـی لـە هەرچـە ترنگـە زیـاترە، /وەك:/ ئـەم کەسـە خاسترین کەسگەلە. پیتەك ترنگ ئەنرگێتە دوای نشاندارەو.)

➢ **پیتەك بووچکی**[7]: «کە، چە، ل، ڵ، کە، ڵە، ڵانە»/وەك:/ چورتك، نیمچە، سەقـْـل، خرتـۆڵ، وردکە، مەشکوڵە، ڕێزڵانە.

➢ **پیتەك جیایی**[8]: «مەگـەر، بێجگـە، بەجگـە»/وەك:/ شـاگردەکان گـشتیان هـاتن مەگـەر ئەحمەد، بێجگە لە ئەحمەد، بەجگە ئەحمەد.

➢ **پیتەك چەمك**[9]: «یانێ» /وەك:/ بوتە یانێ بنچك، گۆزەڵە یانێ ئاوخوەری.

➢ **پیتـەك ئارەزوو**[10]: «کاشك، کاشکای» /وەك:/ کاشك بخوەنایێ، کاشکای جوانیەکەم باتـای دواوە.

➢ **پیتـەك گـەل**[11]: «گەل، ان، کان»/وەك:/ پیـاگگەل، ڕۆژان، پیاکان.(«کـان» پیتـەك ئەشناسـە

---

١ـ پیتەك پرسا: حرف استفهام.

٢ـ پیتەك دووگومانی: حرف تردید.

٣ـ پیتەك چەڵتە: حرف استدراك.

٤ـ پیتەك دوایی: حرف غایت.

٥ـ پیتەك بەرایی: حرف ابتدا.

٦ـ پیتەك ترنگ: حرف تفضیل.

٧ـ پیتەك بووچکی: حرف تصغیر.

٨ـ پیتەك جیایی: حرف استثنا.

٩ـ پیتەك چەمك: حرف تفسیر.

١٠ـ پیتەك ئارەزوو: حرف ترجی.

١١ـ پیتەك گەل: حرف جمع.

لەتەك پیتەك گەلا).

➢ **پیتەك هاوچەشنی**[1]: «وەك، وەسە، چمان، ئاسا، وێنە، انە»/وەك:/ وەك مانگ، وەسە ڕۆجیار، چمان مانگە، خوەی ئاسایی، وێنەی گەلاوێژ، پیاگانە، ژنانە.

➢ **پیتەك بەرەوژوور**[2]: «هەڵ»/وەك:/ هەڵسان، هەڵپەڕین.

➢ **پیتەك بەرەوخوار**[3]: «دا»/وەك:/ دانیشتن، داپەڕین.

➢ **پیتەك فەرمان**[4]: «ب»/وەك:/ بڕۆ!، بیرا!، بسێنە!

➢ **پیتەك قەدەخە**[5]: «مە»/وەك:/ مەڕۆ!، مەیرا!، مەسێنە!

➢ **پیتەك نەبوون**[6]: «نە، نا»/وەك:/ نەپوخت، نائەهل. نەڕوێ، ناڕوێ.

➢ **پیتەك بوون**[7]: «س، ە»/وەك:/ فرەس، خاسە.

➢ **پیتەك واوێژ**[8]: «ئەرێ، بەڵێ»/وەك:/ ئەڕوی؟ ئەرێ. ئەخوێنی؟ بەڵێ.

➢ **پیتەك هێشتن**[9]: «با»/وەك:/ با بێژێ! (یانێ: بلا بێژێ!)

➢ **پیتەك دووبارە**[10]: «و، وە»/وەك:/ هاتەو، هاتەوە.

➢ **پیتەك فرەیی**[11]: «سان»/وەك:/ دارسان، کێفسان، کوردسان.

➢ **پیتەك جێگە**[12]: «گە، گا، دان»/وەك:/ بەنگە، جەنگا، قەڵەمدان.

➢ **پیتەك قاو**[13]: «ئەی، ئەها، ئەهای»/وەك:/ ئەی خوا!، ئەها بڕوانە!، ئەهای باخەوان!

➢ **پیتەك بێداری**[14]: «ها، ئەها، هەلا»/وەك:/ ها مارەکە!، ئەها مارەکە!، هەلا سوار بن!

➢ **پیتەك دارایی**[15]: «ن، ناك، نۆك، اوی، ون، مەن، دار»/وەك:/ چلکن، گۆشتن، خەمناك،

---

١ـ پیتەك هاوچەشنی: حرف تشبیه.

٢ـ پیتەك بەرەوژوور: حرف صعود.

٣ـ پیتەك بەرەوخوار: حرف نزول.

٤ـ پیتەك فەرمان: حرف امر.

٥ـ پیتەك قەدەخە: حرف نهی.

٦ـ پیتەك نەبوون: حرف نفی.

٧ـ پیتەك بوون: حرف ثبوت.

٨ـ پیتەك واوێژ: حرف جواب.

٩ـ پیتەك هێشتن: حرف اهمال.

١٠ـ پیتەك دووبارە: حرف تکرار.

١١ـ پیتەك فرەیی: حرف کثرت.

١٢ـ پیتەك جێگە: حرف ظرفیت.

١٣ـ پیتەك قاو: حرف ندا.

١٤ـ پیتەك بێداری: حرف تحذیر.

١٥ـ پیتەك دارایی: علامت صاحبیت.

ترسنۆك، خشماوی، قینەون، دەوڵەمەن، گەنداز. یانیٚ: دارای چڵك، دارای گۆشت و دارای خەم... تا برویٚ.[1]

➢ **پێتەك واژەبەس**[2]: «ب، هـ، بۆ، بە، لە، لیٚ، چون، چـونکە، هەرچـەن، ئەگەرچـە» ئەمانـە پێتەکگەلێکن واژەگەل ئەوەسن بە یەکەو، بەمجۆرە: بمگرە!، چوومە بازاڕ، چـووم بـۆ بـازاڕ، بـە مـن چە؟، لە من بگرد، لیٚ نایێ، لیٚ ئەچیٚ، چون تەمەڵە، چـونکە شـکیاگە، هەرچـەنی کـرد، هەرچـەنم کۆشا. ئەگەرچە وا نیە.



**«ە»:**

- گایێ نشانەی خدبیەس (اضافه)، وەك: میرەدیٚ، کوڕەزاگ، کەوەڕاو، باخەوان...
- وە گایێ نشانەی نشانیە (وصف)، وەك: نەڕەدێو، جوڕەپیاگ، سەوزە، زلە، ڕەشتاڵە...
- وە گایێ نشانەی کورتیە (ترخیم)، وەك: میرە. کە لە بەرا «میرئەحمەد» بووگە.
- وە گایێ نشانەی شناسیاگیە (عهد)، وەك: یارۆی زلە.



**«گە»:**

- گایێ نشانەی بژنەویە (خطاب)، وەك: کوڕەکە بڕوانە!، براکە بڕوین!....
- وە گایێ نشانەی شناسیاگیە (عهد)، *[وەك:]* کوڕەکە، پیاکە، ژنەکە....

---

١ـ «وان» علامت تصدی است،[مثل:] باخەوان، ناسیاوان.[«وان» نیشانەی لە ئەستۆگرتنە، وەك: باخەوان، ناسیاوان]

٢ـ [پێتەك واژەبەس: حرف ربط]

## گۆڕگەگەل
## یانێ نووکەگەلێ کە بە یەکترین ئەگۆڕگێنەوە

ا ← ع، ھ، و، ی، ح
ب ← و، ف، م
پ ← ف، و
ت ← ط چ ز ش د ژ
ث ← س
ج ← ژ، د
چ ← ت، ش
ح ← ھ، خ، ع، ا
خ ← و، ح، ع، غ، ق
د ← و، ذ، ز، ج، ن، ت
ذ ← د، گ، ە، و
ر ← ل، ڵ، س
ز ← د، ژ، س، ش، ت
ژ ← ج، ز، ش، ت
س ← ص، ە، ث، ر، ز
ش ← ز، ژ، ت، ڵ، چ
ص ← س
ض ← ز، س
ط ← ت
ظ ← ز
ع ← خ، ح، ی، و، ا
غ ← خ، ھ، ق، ک
ف ← ب، پ، و
ق ← غ، خ
ک ← غ
گ ← ھ، ذ، و
ل ← ڵ، ر

ڵ ← ل، ش، ر
م ← و، ن، ب
ن ← د، م
و ← ب، ا، خ، م، ع، ف، ی، پ
ە ← ح، س، ا، و، گ، غ، ذ
ی ← ع، ا، و

لەتاتیا:

پ ← ف (پەڵپینە: فرفرینج)
چ ← ج، ش
ژ ← ز، ج
ت ← ت
ح ← ح
س ← ص (سەرد: صَرد)
گ ← ج (گورگان: جرجان)
ە ← ح




☜ «ئـ»

❖ ئاردی بێخ دڕك گردەو ناوێتەو.

❖ ئاردی ڕویگە، سۆسی ماگە.

❖ ئاسمان لەبەر چامەو [چاومەو] تاریك بوو.

❖ ئاسمان و ڕێسمانە.

❖ ئاسن سەرد ئەکوتێ.

❖ ئاسیاو فرەهاڕ، وردیـچ ئـەهاڕێ، دوشـتیچ ئەهاڕێ.

❖ ئاسیاو کار خوەی ئـەکا، چەقـچەقە سـەر خوەی تێرێتە ئێش.

❖ ئاسیاو گرمەی تێ، ئاردی دیار نیە.

❖ ئاشتی کتك و مشکە.

❖ ئاشتی کتك و مشك، پرسەی بەقاڵە.

❖ ئافتاوەو لوولەینە کارێك ئەکـەن، بارمتـە نیانیان حەساوە.

❖ ئاگر لە چاوی ئەوێتـەو= ئـاگر لـە چـاوی ئەوارێ.

❖ ئاگرە سووری، لە من دووری.

❖ ئاو ئەزایتە دەمی.

❖ ئاو ئەکاتە بێژنگ.

❖ ئاو ئەکاتە سەوەتە.

❖ ئاو بێ‌لەغاوی خواردگە.

❖ ئاو ڕژیا، گردەو ناوێتەو.

❖ ئاو ژێر کاس.

❖ ئاو شەرمەساری دەر دا.

❖ ئاو لە سەرچاوکەوە لێڵە.

❖ ئاو چاوی سنیاگە.

❖ ئاو لە دنگا ئەکوتێ.

❖ ئاو لەسەر من بگرد، چ یەك گـەز چ سـەد گەز.

❖ ئاوێ بڕوێ بۆ ڕۆخانە، خوێش بیخـوا نـەك بێگانە.

❖ ئاوی بەستگەسە ژێری.

❖ ئاوی خراو ڕژیاگە.

❖ ئاوێك چوو بە جۆگەیکا هەر ئەشێ بڕوێ.

❖ ئاوی لە چاوی سەنـگە.

❖ ئاوی ها بە بێڵەو.

❖ ئاوی ها بە جۆگەوە.

❖ ئاهووی مانیاگ ئەگـرێ.

❖ ئاهووی ئەگیریاگ ئەوەخشێ.

❖ ئاهووی ئەگیریاگ فرەس.

❖ ئاینە ئەگرنە بەردەمیەو. (حـال احتـضار.) [(کاتی گیان دەرچوون.)]

❖ ئوجاخی کوێرە.

❖ ئوجاخی کوێرەو بوو.

❖ ئەدا بە لای مارا جووجکەی ئەقرتنێ.

❖ ئەسپێ بە چل ساڵەگی تـالیم بـدرگێ، بـۆ مەیان قیامەت بە کار ئەخوا.

❖ ئەگەر دەسی برِویٚ لە پشتەو پیاگ سەر ئەوڕیٚ.

❖ ئەگەر کاوێژی بکردایێ، گۆشتی بۆ خواردن ئەشیا.

❖ ئەگەر گورگ نەویت، سەگگەل ئەتخوەن.

❖ ئەگەر گۆشت گرانە، نەخواردنی هەرزانە.

❖ ئەگەر گ مەلیٚ مێوەخوەر بوایێ، مێوە بە دارەو نەنەما.

❖ ئەگەر لە جافان یەکیٚ بمێنی، حەق بەرودوا لە گشت ئەسێنیٚ.

❖ ئەلفەلەیلە ئەخوێنیٚ.

❖ ئەم دەسەکەی لەو دەسەکەی چلك ناگریٚ. (ما تَبُلُّ احدی یَدَیهِ الأُخری.)

❖ ئیمرۆژ و سۆزی ئەکا.

❖ ئەمسەر کریٚ و ئەو سەر کریٚ، پارەکریٚ و پینەکریٚ.

❖ ئەم کاسە بیٚ ژێرکاسە نیە.

❖ ئەم مردگە بەم شیوەنە ناژی.

❖ ئینسان قەدری ها بە خوەیەو.

❖ ئینسان لە سەریوان گەورەدا خولٚ بکا بە سەرا.

❖ ئەو خورما تۆ خواردکتە، من بە قلینچکەی بازیم کردگە.

❖ ئەو کەسە گیان نەدا، گیانیچ نەسێنیٚ.

❖ ئەو گولەزەوینە پاك بێت خوەمی تیا دانیشم.

❖ ئەونە باریك بووگە، بە کونای دەرزیا ئەڕوێت.

❖ ئەونە بیٚ و بچۆ، قەدرت نەچۆ.

❖ ئەونە بچۆرە باوان، بەریٚ بە ژێرت بیاوان.

❖ ئەونە بە شۆن دزا برۆ، لێتهەڵنەگەرێتەو.

❖ ئەونە تیژهۆشە بە چاو راز دۆس و دوژمن ئەزانیٚ.

❖ ئەونە چاو بنی بە یەکا هەڵنەقولیٚ.

❖ ئەونە گەریاگە دریاگە.

❖ ئەوە خەتەنەسووران بوو، زەماوەن ها لە دواوە.

❖ ئەوە کاوربازی بوو، ئەمە بەرانبازیە.

❖ ئەوە لە کاسەدا بیٚ، بە کەوچك دەرتیٚ.

❖ ئەوەیا بەخت هاوردوی بۆی، بە نەزانکاریك داینیا.

❖ ئەوەیا خاوەماڵ ئەیزانی، ئەگەر دز بیزانیٚ هیچێك نایلیٚ.

☜ «ب»

❖ با بیٚ شەن ئەکا، باران بیٚ ئاسیاو ئەگەڕنیٚ.

❖ باخەوان لە وەخت هەنگوورا گوێچکەی ناژنەویٚ.

❖ بار لە باج نانالیٚ.

❖ بارە شاری تێتەو.

❖ باریکان ئەرِیسیٚ.

❖ بازگولی بە جەماڵ شێرو.

❖ باجان پاك ئەکا.

❖ باوان شێویاگ سەر لە کار خوەی دەرناکا.

❖ باوێشکی بۆ ئەدا.
❖ بەچکەگەدا مەخرە تەما، بە چلێ کەما تیتە سەما.
❖ بەدبەختی کلاَفە ئەکا.
❖ بەدترین لە بەد بەدترە= بەد لە بەدتر خاسترە.
❖ بدە لە ئاو، مەدە لە پردی نامەرد.
❖ برا لە پشت برا بێ، بەلاَ مەگەر لەلای خوا بێ.
❖ براییمان برایی، کیسەمان جیایی.
❖ برج زەهرمار ئاوێتە دلّدار.
❖ بەرچاوتەنگی رسوایی تێرێ.
❖ بەرچاوتێر ئاورووەمنە.
❖ بەرزپەرین مل پیاگ ئەشکنێ.
❖ برسیەتی رەگ هاری ها پیەو.
❖ بەر لە کارێز ئاوی گەرەکە.
❖ بەرِ لە لای تەنکیەو ئەدرِگێ.
❖ بەرودوای قسەی خوەی نازانێ.
❖ بزانە زانست لە کوێ هێلانەی بەستگە.
❖ بزن بە پای خوەی ئەکێشگێتە دار، پەزیچ بە پای خوەی.
❖ بزن گەرِۆلّ لە سەرچاوکەوە ئاو ئەخوا.
❖ بزن لە حیزیا نەئەچووە رێگەدا، ئەیانکردە حەچەی ران.
❖ بزنەقوت لە من چوو، سەربنێ بە هەزارەو.
❖ بەزە بەو خوێنە شەوی بە سەردا بیێت!
❖ بەزە بەو رۆژە رەحم ئاشکرا ئەوێ!
❖ بشێوە لە دەمیا خێزاو ئەکا.
❖ بکوژێ قەساو، بورِێ قەساو.
❖ بەلاَ لە بۆگەن ئەوێتەو.
❖ بنەجۆی شێلیاگە.
❖ بەنی شلەو بووگە.
❖ بەو با ئەژیم لە تەرەف توەو بێ.
❖ بۆ دەسمالێ قەیسەرییێك ئاگر ئەدا.
❖ بووگە بە ماکەرەکەی قولّیان.
❖ بووگەسە ئارد بێخ درِك.
❖ بووگەسە سووکەی بەر قەفەز.
❖ بووگەسە کەر گووشلخواردگ.
❖ بووگەسە کەر ناو جۆگە، لە هەرتكلا ئەخوا.
❖ بووگەسە مووی نوك لووت.
❖ بۆی بشێوە لە دەمی رۆژی رێگە ئەروێ.
❖ بە ئەنازەی بەرِ خوەت پا داکێشە.
❖ بە بالّ یەکیتر ئەپەرێ.
❖ بە بگار نەگەیشتگ شوالّ ئەکەنێ.
❖ بە بۆنی گولّێ گەنەو هەزاران گولّ مرۆر ئاو ئەخوا.
❖ بە بوەو ئەروێ.
❖ بە پف کاسەگەری دوروس ئەوێ.
❖ بە پفێ دائەگرسێ و بە تفێ ئەکوژێتەو.
❖ بە تاقەگولّێ بەهار نایت.
❖ بە تەنیا دەسێ چەپ ناکوتگێت.
❖ بە جارِیا نەچووگە.
❖ بە چاو خەفتگ، بە دلّ وریا.
❖ بە چاو گەرەکیە.
❖ بە چاو گەرەکیە دلّگەل کونا بکا بزانێ

چەی هاتیا.

❖ بە حەفت ئاو شۆریاگەسەو.

❖ بە حەفت تەوەر ملیٚ ناوڕگێتەوە.

❖ بە حەفت قەلّەم خوەی ئاڕایشت کردگە.

❖ بە دزی ئیزراٸیلەو ئەگەڕیٚ.

❖ بە دەس خوەی ئاگری بەرداگەسە گیان خوەی.

❖ بە دەس مەردم مار ئەگریٚ.

❖ بە دەسیٚ دوو کالّەك هەلّناگیرگیٚ.

❖ بە دەم و بە دەس تیٚ وەشیاگە.

❖ بە زوان پیاگ ئەگریٚ.

❖ بە زوان خوەش مار لە کونا دەرتیٚ.

❖ بە زوان شێر ئەکاتە ریوی.

❖ بە سەر ئاو حەمامەو ئاشنایی ئەگریٚ.

❖ بە سەروەخت گشت کەسێکەو ئەڕویٚ.

❖ بە سەری گوشادە.

❖ بە شەو جەردە، بە رۆژ مەردە.

❖ بە کارەکەر بێژی: «خانم!» هەرچیٚ کاسە و کەوچکە ئەشکنیٚ.

❖ بە کاسەیك ئەیکەن، بە کەوچکیٚ ئەیخوەن.

❖ بە گورێس تۆ کەفتگەسە چالّ.

❖ بە لەوز قەلّەم قسە ئەکا.

❖ بە میزەی کتك باران ناواریٚ.

❖ بە نەوگ مەردوم سەر ئەوڕیٚ.

❖ بە هەر چاویٚ تۆ من ئەوینی، هەر بەو چاوە منیچ تۆ ئەوینم.

❖ بیٚ بگار لە ئاو ئەدا.

❖ بیٚ دەس شکانن نگین ئەشکێنیٚ.

❖ بیٚ سڕنا هەلّئەپەڕیٚ.

❖ بێشکەی من سەمەرەی جوانگیە.

❖ بیٚ نا ئەیژەن، ئیسە نایچ ها بە دەسیەو.

☜ «پ»

❖ پا ئەدا لە پەیین.

❖ پابەپا بە یەکەو ئەڕۆن.

❖ پاچکە بدەی بە ناکەس، هەوەس رانیچ ئەکا.

❖ پاش باران کەپەنْك؟

❖ پا لە بەڕ خوەی درێژ ناکا.

❖ پا لە ژێری دەرچووگە.

❖ پا نالّ پەرت ئەکا.

❖ پرشنگی لیٚ ئەوێتەو.

❖ پەژارە بێدەنگی کردگە.

❖ پشت حەفت کێف رەش بیٚ.

❖ پشت دەس خوەی برد بە دەما.

❖ پەشیمانی ئەگەر شاخی بوایێ، سەدگەز شاخی بوو.

❖ پەشیمانی گورگ مەرگە.

❖ پەشیمانی نەوتن لە پەشیمانی وتن خاسترە.

❖ پف لە بوولّەمڕ ئەکا. (یَضْرِبُ في حدیدٍ باردٍ.)

❖ پەلەپیتك ئەوەشنیٚ. (کنایە میزند.) [(تانە ئەدا.)]

❖ پۆسکەنە قسە ئەکا. (صراحت لهجه دارد.)

[(پێچوپەنا لە قسەکردنیا نیە.)]

❖ پۆسی دەواخی نایێ.

❖ پۆسی کەن. (بـد بیـیش گفـت.) [(قـسەی خراپی پێ وت.)]

❖ پوولێ بە پەڕۆ ئەکا.

❖ پوولێ چەرمگ بۆ رۆژ رەش خاسە.

❖ پوولێ مەردم کیسە ئەدڕێ.

❖ پیادە ئەزانێ سوار تەنگی بەربووگە.

❖ پیاز ئەوڕالآن خواردنی هەس و بردنی نیە.

❖ پیاگ وەختێ ماتلێ بێ، قەوم دوور و قـەرز کۆنە ئەکاتە یاد.

❖ پەیبەننی خاس کریاگە.

❖ پیر لە پیری نیە لە سەرگوزەشتەییە.

❖ پیری و سـەڕ عـەیب، بێـخۆ نـەیان-وتگە.

❖ پێس بێشەرمی کێشاگە بە رووی خوەیا.

❖ پێس سەگ بە دەواخی پاکەو ناوێ.

❖ پێس قورواق بە دەواخی ناژی.

❖ پێشەی خوەی شکانـگە.

❖ پێـشەی رەش نەکردگـە. (یعنـی جـوان است.) [(واتە گەنجە.)]

❖ پەیمانەی تەواو پڕ بووگە.

☜ «ت»

❖ تا ئەیژێ: «هالە»، هەنگوور پێ‌ئەگەیێ.

❖ تـا پیرێـك ئـەمرێ، هـەزار هـەزار جـوان ئەمرێ.

❖ تا ریوی قەوالـەی خـوەی خـوەن، پێـسیان کەن.

❖ تا تۆم نەوەشنی، خەرمان هەڵناگری.

❖ تا ژێر بیری کردەو، شێت لە ناو پەڕیەو.

❖ تاس بشکێ نەك بزرگێ.

❖ تا کۆسێ نەرمێ کەننێ پڕەو ناوێتەو.

❖ تاڵ و سۆڵ دنیای فرە چەشتگە.

❖ تـا ماڵخـاون دزی گـرت، دز ماڵخـاونی گرت.

❖ تا ماڵ وێساوێ، مزگت حەرامە.

❖ تانجی قۆچاخ لە وەخت راوا گووی تێ.

❖ تا نەیچەشی نازانی.

❖ تاوانکار ها بە لای یارەو، بێتـاوان سـەری ها بە دارەو.

❖ تایی گان ئەکا، دۆڵاوی ئەیبژێرێ.

❖ تـڕ بـە تەوەرداسـیەوە چـە؟ هـەمزە بـە هەواسیەوە چە؟

❖ تورمـە هەرچـەن کۆنـە بـێ، بـە پاتـاوە ناکرگێ.

❖ تەڕی و هەسی چێشت مشتێکە.

❖ تف بەرەوژوور تێتەوە ناوچاو خوەی.

❖ تەقـەی سـەری تـێ. (نمـی‌فهمـد.) [(تێناگات.)]

❖ تەنوور تا گەرمە نان ئەڕا.

❖ توانایی ئەونەسە لە چاوترووکانێکا شـارێ بشێنێ [بشێوێنێ] و نارامی بکا.

❖ تەواو ئەنامی ئەکەنێ.

❖ تەواو ئەنامی هەرکام بە جیا ئەیـژێ: مـن

خاسم.

❖ تۆپین کەر زەماوەن سەگە.

❖ تۆشەی ئاوە.

❖ تۆشەی مەردم برسیەتی ناشکنێ.

❖ توولّ بە تەڕی نەچەمێتەو ئیتر ناچەمێتەو.

❖ تۆ لە حەمەتاشەوانی چاکتر نازانی.

❖ تۆم کرد بە جۆلآ مەکوم بدزی؟

❖ تۆم کۆنە لە دلّیا وەشیاگە.

❖ تۆ هەنگاوێ روو بە مـن بـێ، تـا مـن دە هەنگاو روو بە تۆ بێم.

❖ تیخی ئیسە ئەونە ناوڕێ.

❖ تیر ئەخاو کەوان ئەشارێتەو.

❖ تیر لە ترکەشیا نەماگە.

❖ تیر لە کەوان دەرچوو ناگەڕێتەو.

❖ تیر ئاگای لە برسی نیە.

❖ تیرێك و دوو نشانە.

☜ «ج»

❖ جەرگی برپاگە.

❖ جەرگی سووتیاگە.

❖ جەرگی بۆ هیچ کارێ نیە.

❖ جەنگ لەسەر تەنگی سجافە.

❖ جەنگ لەسەر کەمی سفرەس.

❖ جەنگ لە کۆنەقینەو هەلّئەسێ.

❖ جەنگ زەڕگەرانەس.

❖ جـەنگ کوژیاگەسـەو، چـلّمنە شـۆن چـێو ئەگەڕێ.

❖ جۆگەلە دەریا لیّلّ ناکا.

❖ جووجەلّە ئەکوژێ و هیلکە هەلّتێرێ.

❖ جێگەی شابازان کۆرکۆرە وازان.

❖ جێگـەی تـازە گـەرم کردگـە، بـەم زوو[ە] هەلّناکەنێ.

❖ جێگەی گەرم نەکرد، لیّدا ڕۆی.

☜ «چ»

❖ چارەی بێچارە تاملّ و سەورە.

❖ چارەی نەخوەر بخوەرە.

❖ چاوبرسی ئاوڕووی نیە.

❖ چاوتێر ئاوڕوودارە.

❖ چـاو جـن دەرتێـرێ. (هـرزە اسـت.) [(هەرزەیە.)]

❖ چـاو مـار دەرتێـرێ. (تیرانـداز اسـت.) [(تیرهاوێژی باشە.)]

❖ چاوی چەرمـێـگ بووگـە. (هـلاك شـدە.) [تیاچووە.)]

❖ چت خاس خوەی هاوار ئەکا.

❖ چەرخی لە چەمەر گەڕان.

❖ چەقۆ دوڕس ئەکا و دەسەی لێناخا.

❖ چەلّەتەوەشێن ڕەهەنەی عامە.

❖ چما ئەیژی بۆ ئاگر هاتگە.

❖ چمان ئەیژی گوێز ئەکاتە هەوانە.

❖ چەن مەردە هەلاجە.

❖ چەن سالّە بە دەور ئەم کارا گێچکە ئەکا.

❖ چەن سالّە گەداس، شەو جمعە نازانێ.

❖ چنگ لە دڵ نادا.

❖ چوکڵەشکێن خوەی ئەشکنێ.

❖ چێو هەڵگرە، سەگ دز دیارە.

☜ «ح»

❖ حاشا لەو خوێنە شەو بە سەریا بێ!

❖ حەزی ئەکرد بمرێ و ئەم قسە نەژنەوێ.

❖ حەش ئەگەر بێژن: هیلکەی کرد. کردگیە؟

❖ حەق بزن کۆڵ بەسەر شاخدارەو نامێنێ.

❖ حوکم حاکمە و مەرگ مفاجات.

❖ حەنجەرە لە پەنجەرە دەرنەچێ خاسە.

❖ حەواڵەی سەر یەخەچاڵە.

❖ حەیا لەم وڵاتە باری کردگە.

❖ حەیا ها بە چاوەو، چاو نەوێ حەیا کوا؟

☜ «خ»

❖ خار لە رێگەی دڵپاکا نیە.

❖ خار نایتە رێگەی دڵپاك.

❖ خاوغـــاڵ دەســـی هـــەڵگرت، دزئـــەیوت: ئەیگەینمە حەق جێگە.

❖ خەرەمەژگی وەسە خواردوێ.

❖ خەلەفرۆش هەواڵ مەن ئەپرسێ.

❖ خلیسکیان جیرەی پەلەکارە.

❖ خەمــەرە هــۆش ئەدۆشــێ. (اَلْبِطْنَــةُ تَــأْفِنُ الْفِطْنَة.)

❖ خنجەرێتریان داگە لە زەخمی.

❖ خنجەری لێ بدەی خوێنی دەرنایێ.

❖ خوا ئەپژنێ بە زەخمیا.

❖ خوا بار نەنێ، باری گرانە.

❖ خوا پا بە مار نادا.

❖ خوا دەرد ئەدا، دەرمانیچ ئەدا.

❖ خوا سەرما بە قەدِ بەرگ ئەدا.

❖ خەو ئاشۆپاشــۆ بــە خــەوەرەوبوون لەســەر دەرنەچێ.

❖ خوا غەزەو ئـەگرێ لـە مرۆچـە بـاڵی پـێ ئەدا.

❖ خوا غەزەو بگرێ لە بزن ئەچێ نـان شـوان ئەخوا.

❖ خوەت مەکوژە جەفتە.

❖ خوەرەتاو لچ بان دەوامی نیە.

❖ خوەشە ئاگر خوەشە دوو، برا خاسە نە وەك شوو.

❖ خوەی ریشی نیە بە کۆسە ئەکەنێ.

❖ خوەی گوم کردگە هەڵە ئەروێ.

❖ خەوی لێ سنیاگە.

❖ خوێن پڕ چاوگەلی بووگە.

❖ خوێن تۆ لە خوێن من رەنگینتر نیە.

❖ خــوێن رژیاگەســە دەموچــاوی. (خجالــت می‌کشد.) [(تەریق ئەبێتەوە.)]

❖ خوەی نەکا خوا بۆی بکا.

❖ خــوێن لــە بــەدەنیا نەماگــە. (ترسیده.) [(ترساوە.)]

❖ خــوێنی بــا بــردی. (خــونش هــدر رفــت.) [(خوێنی بە فیرۆ چوو.)]

❖ خێر بۆ خوێش نەك بۆ دەورێش.

❖ خێزاوەی قین لە دەروونیا گێج ئەخوا.

❖ خەیلێ کار گەورە پیاگ بووچـك ئـەنجامی ئەدا.

☜ «د»

❖ داخو درۆش ئەکا.

❖ دار لەبەرا پێشەیکە.

❖ دار لەتەك تۆمە، دیوار بژنەوە!

❖ داری داگە بە رۆح حاتەما.

❖ داگیە بە گەنەی دەماخیا.

❖ داگیە لە حەفت ئاو قولی تەڕ نەوگە.

❖ داڵکە! تا تۆ مۆچیاری من کردی، سـەد و سی مەگەز وە گون خەرە تاڵەوە شمەردم!

❖ داماگی سەر پیاو ئەکاتە درگای نامەردا.

❖ دانا بە درکە، کەر بە نەقیزە.

❖ داوا لەسەر تەنگی سجافە.

❖ دایـك دز رۆژێ سـین ئـەخوا، رۆژێ سـین ئەکوتێ.

❖ دەبە هێن کوردە و گۆران ئەیکا.

❖ دەرد بێ سامان دووری دیدارە.

❖ دەرد دڵ بۆ ژێر گڵ.

❖ دەرزی هەڵخەیتا زەوی ناکەفێ.

❖ دڕك ئەکێڵێ، دڕك تێتە ڕێگەت.

❖ دڕك هەنگوور ناگرێ.

❖ درگای کەس مەتەقنە، تا درگات نەڕەقنن.

❖ درۆ بە دڵەو ناچەسپێ.

❖ درۆزن کەمهۆشە.

❖ درۆ هێچتا لە دەم دەرنەهاتگە لۆقە ئەکا.

❖ دەریا بە دەم سەگ چەپەڵ ناوێ.

❖ دز ئەونەیە ستەمە کەلەوەر رەش کا.

❖ دز مەیل دزی بێ، تاریکەشەو فرەس.

❖ دز ناشی لە کادان ئەدا.

❖ دژمەن هێـدیەو کە، ئـەنجا تـەپ بدەرە سەری.

❖ دەسباد بە پێشواز گەداییەو ئەڕوێ.

❖ دەس بان دەس فرەس.

❖ دەسخەت ناهمێـدی داگە بە دەسیەو.

❖ دەس و دڵی سەردەو بووگە.

❖ دەس خوەی برد بە دەما.

❖ دەس خوەی تا ئیسە نەبردگە بە دەما.

❖ دەس دوانزە ئیمامی بڕیگە، شـۆن چـواردە مەعسووم ئەگەڕێ.

❖ دەس خوەی نیە ماری پێ ئەگرێ.

❖ دەس کەس پشت کەس ناخۆرنێ.

❖ دەسە [دەستت] بە کـەوگیرەوە بـێ، چـاوە [چاوت] بە هەژار و فەقیرەوە بێ.

❖ دەسە چەورەکەی گەرەکیە بـساوێ بەسـەر مەردما.

❖ دەسەزرانی دانیشتگە.

❖ دەسەسەرکردن دژمەنی تێری.

❖ دەسەسەر و پەنا بە خوا.

❖ دەسیچ ئەوەشنێ و هاواریچ ئەکا.

❖ دەسێ حاکم بێوڕێ خوێنی نیە.

❖ دەسی لە دنیا داشتگە.

❖ دڵ بە درۆ ناسووتێ.

❖ دڵ بە دڵ ڕێگەی هەس.

❖ دڵ سفرە نیە، ئینسان بۆ گشت کەسێکی بکاتەوە.

❖ دڵ کوچـْـك نیە، لە گوڵ نازگترە.

❖ دڵ کـەس ڕێـش مەکـە، ڕێـشت کـرد بێئەنێش مەوە.

❖ دڵ لە پەڕەی گوڵ نازکترە.

❖ دڵ لە دڵ ئاگاهە.

❖ دڵی پڕە لە زووخاو.

❖ دڵی تێ بەیەکا.

❖ دڵی سووتیاگە.

❖ دڵی شکیاگە.

❖ دڵێ نە، هەزار دڵ حەسپەنی ئەوێ.

❖ دڵی وشکەساڵ حەسپەن دیدارە.

❖ دەماخی پروياگە.

❖ دەماخی سازە.

❖ دەماخی سووتیاگە.

❖ دەموچاوی لە تەك ڕۆجیارا شەڕ ئەکا.

❖ دەم و دەسی یەك ناگرێ.

❖ دەمی بوو بە تاق چراداِن.

❖ دەمی بوو بە تەڵەی تەقیاگ.

❖ دەمـی پـڕە لـە خـوێن. (عـزادار اسـت.) /(تازیەبارە.)/

❖ دەمی چووگە بە ئاو کولاّتگا.

❖ دەمی سووتیاگە.

❖ دەنگ دەوڵ لە دوور خوەشە.

❖ دنیا بنی قووڵە. (فضا غیرمتناهی است.) /(گەردوون ئەوپەڕی دیار نیە.)/

❖ دنیـا هـەر مێـزە. (دنیـا آشـفتە اسـت.) /(دونیا شێواوە.)/

❖ دنیا کلاّوکلاّوە.

❖ دوای بـاران کەپـەنـْـك؟ (پـس از مـردن نوشدارو؟) /(دژەژار پاش مردن؟)/

❖ دوای ئـــەوە دی حـــەریف فـــەنبازە، بێدەسومشتاق چوو بە ناوقەدیا.

❖ دوو بزنی بوێ، یەکێکی ئەکاتە یەدەك.

❖ دۆ تا نەیژەنی کەرە نادا.

❖ دوور برۆ، دوروس بێرۆ.

❖ دووربینی دوا ئەکا.

❖ دووربینی دوا پەشیمانی نیە بە شۆنیەوە.

❖ دووڕوو و دووزوان سەری ها بە خوێنەو.

❖ دووڕوو بێئاوڕووە.

❖ دۆس و دژمەن خوەی ناناسێ.

❖ دۆس و دژمەن لە یەك جیا نـە ئـەکریاوە. (طلوع صبح.) /(سەرەتای بەیانی.)/

❖ دووکەس لە پشت بێژنگەو ئەڕوانْن بەیەکا، هەرچلۆنێ بێ ئەو ئـەم ئـەوینێ، ئـەمیچ ئـەو ئەوینێ.

❖ دووکەڵ لە تەوق سەری بەرزەو بوو.

❖ دۆڵەی پڕ راسی ماڵە.

❖ دۆم بێێت و کلاّش بۆ خوەی بکا.

❖ دوو نەفەر بچنە لای قازی، یەکێکی تێتەو بە رازی.

❖ دە بدە بەهەشت، هەشت بگرە لە مەشت.

❖ دیان ئێشان چارەی کێشان.

❖ دیانی تێژەو کردگە بۆ خواردن ماڵ مەردم.

ك: چەنەوەری. هەڵیتوتن.[زۆربلێیی، فرەرپسی. ژاوەژاو]

ف: چانــەزدن، زنــخزدن. ژاژگــویی، ژاژخــایی، هرزەگویی، هرزەدرایی، بیهودەگویی.

ع: هَذَر، بَقبَقَة، ثَرثَرَة.

**چناکەشکیاگ**

ك: چەنەوەر، هەڵیتوێژ، مفتوێژ.[زۆربلێ، فرەرپس]

ف: هــرزەچَنــە، پُرچانــە، ژاژگــو، ژاژخــای، مُفتگو، بیهودەگو.

ع: مِهذار، بَقباق، ثَرثار، هَذّار.

**چناکەهەڵتەکانن**

[ك: چەناکە تەکاندان.]

ف: چانە تکان دادن.

ع: نَشغَة.

**چنگ**

ك: پەنجۆڵە. چنگاڵ.[پەنجــەی دەســتی مرۆڤــ، درنــدە یــا باڵندە.]

ف: چَنــگ، پَنجــە، اَنگُــشتان. چَنگــال، چَنگُــل، چَنگُله.

ع: اَصابع. مِخلَب، ضُباث، کَلالیب، بَراثِن. (بُرثُن)

وێنە

**چنگ**

ك: مشت. (چنگی پڕ کرد.)[مست]

ف: مُشت.

ع: قَبضَة، قَمزَة.

**چنگ**

[ك: نێوان پەنجە و لەپی دەست](چنگی لێگرت.)

ف: چَنگ.

ع: هَصّ. (علی الثَّلج مَثَلاً.)

**چنگاڵ**

ك: چنگ.[پەنجەی درندە و باڵندە.]

ف: چَنگ، چَنگال، چَنگُل، چَنگُله.

ع: مِخلَب، بَراثِن، کَلالیب.

وێنە←چنگ

**چنگاڵ**

[ك: چەتاڵ]

ف: چَنگال.

ع: شَوکَة، مِلقَط، مِنشَل. (فُرتیکة)

وێنە

**چنگاڵ و ڕۆن**

[ك: چنگاڵ، هەرمێشك (نان یا کولێرەی تریــت کــراو لــە ڕۆنی داخدا.)]

ف: چَنگال، چنگالی، انگــشتو، سُــکارو. (نــان یــا گرده که توی روغن داغ شده ترید کنند.)

ع: دَلیك، حَیس.

**چنگاوڵ←پووکاوڵ**

**چنگاوێز**

ك: دەسەداینە.[تێوە ئاڵان. تێوەئاڵاو، دەسەوداوێن]

ف: بلک، آگیش، دست به دامن.

ع: مُتَشَبِّث. تَشَبُّث.

**چنگگرتن**

[ك: چرنووك لێگرتن. (وەك: چنگ‌گرتنی پشیلە.)]

ف: چنگ‌زدن. (گربه مثلاً.)

ع: خَلب، ضَبث.

**چنگ‌لێگرتن**

[ك: گوشین لە نێوان پەنجە و لەپی دەستدا. (وەك: چــنگ گرتن لە بەفر.)]

ف: چنگ گرفتن. (از برف مثلاً.)

ع: هَصّ.

**چنگلە**

ك: سەڵاتی.[(قەرتاڵەی بچووك.)]

ف: باوین، چلالی، ســاوین، ســاویس، سَــبَدچه، سراچه، گیره. (سَبَدچەی کوچک)

ع: سَلَّة، مِشیَعَة.

وێنە

**چنگلەسمرە←چنگنەسمرە**

**چنگ مریەم**
[ك: بخوورمریەم: گیایەکە.]
ف: چَنگ مَریَم، پنجه مَریَم، بخور مَریَم.
ع: کَفُّ مَریَم، بُخورُ مَریَم، بُخورُ الْاَکراد.
وێنە

**چنگنە**
ك: گەنە.[(جۆرە گەنەیەکە.)]
ف: گاوَک، غَسَک. (از جنس گنه است.)
ع: قَرشُوم.
وێنە

**چنگنەسەرە**
ك: گژنەسەرە، چنگڵەسەرە.[قژنەسەرە، سەرقژن]
ف: چنگلەسره.
ع: قَطَط، مُفَلفَلُ الرَّأس.

**چنگەرنێ**
[ك: چنگەکرێ: پەنجە لە زەوی گیر کردن بۆ سەرکەوتن.]
ف: چنگ گیر کردن.
ع:...

**چنین**
ك: کەنْنەوە.[رنین(ی میوە لە دار.)]
ف: چیدن، چنیدن.(میوه از درخت.)
ع: قَطف، لَقط، جَني، اِقتِطاف، اِلتِقاط، اِجتِناء.

**چنین**
ك: دوورانْن، برین.[دوورینەوە(ی گیا.)]
ف: چیدن، بُریدن. (گیاه)
ع: جَزّ، اِحتِشاش.

**چنین**
ك: بژنین. (برنج مەسەلەن.)[بژاردن (وەك: بژاردنی برنج.)]
ف: پاک‌کردن.
ع: تَغلِیَة.

**چنین**
ك: دورروس کردن.[تەنین (وەك: چنینی گۆرەوی.)]
ف: بافتن. (جوراب مثلاً.)
ع: نَسج.

**چنین**
[ك: نەخشاندن(ی تاج، کڵاو و...)]
ف: دوختن. (تاج، عرقچین و . . .)
ع: تَطریز، تَدبیج، تَوشیَة.

**چنین بان یەك**
[ك: لەسەر یەك دانان، کەڵەکە کردن]
ف: روی هم چیدن، بالای هم گذاشتن.
ع: رَثد، نَضد. زَبر، رَکم، تَنصیص.

**چنین لای یەك**
[ك: خستنە پاڵ یەك، ڕێك خستن]
ف: پهلوی هم چیدن، لای‌هم گذاشتن.
ع: نَضد، تَوسیق، تَنسِیق، تَرصِیف.

**چنینەوە**
ك: گلێرەوکردن، گردەوکردن.[هەڵگرتنەوە و کۆکردنەوە.]
ف: گرد کردن، چیبیره‌کردن، گروزه کردن، برداشتن.
ع: قَرش.

**چو**
ك: چێو.[دار]
ف: چو، چوب، درود.
ع: خَشَب.

**چوار**
[ك: ژمارەی پاش سێ.]
ف: چهار، چار.
ع: اَربَعَة.

**چوارنایتە**
[ك: چوارڕێنە (جۆرە زرێیەکی شەڕە.)]
ف: چهار آینه، جَوشَن. (نوعی است از جوشن.)

ع: دِرع، يَلَبَة.

**چواربا**

[(ك: بـای ڕۆژهـەڵات، بـای ڕۆژئـاوا، بـای شـەماڵ، بـای باشوور.)]

ف: چهار باد. (باد صبا، باد دبور، باد شمال، باد جنوب)

ع: أربعَة، رِياح أربَعَة.

**چواربەن**

ك: قورسی.[کورسی: مێزێکی تایبەت بـوو کـە زسـتانان ئاگریان دەخستە ژێری و بە دەوریدا دەنوستن.]

ف: چهاربند، كُرسی.

ع: كُرسِيّ.

وێنە←قورسی

**چواربەن←ڕوباعی**

**چوارپا**

ك: چاروا، ماڵات.[چوارپێ، ئاژەڵ]

ف: چهارپا، چارپا، سُتور، اُستور.

ع: مال، نَعَم، ماشِيَة، دَوابّ.

**چوارپاچکە**

[ك: هەر شتێکی چوار پێچکە, وەك: کورسی و مێز و...]

ف: چهارپایه، چهاربند.

ع: قَوائِم، اربَعَة قَوائِم.

**چوارپاڵوو**

ك: شەشپاڵوو.[شەشڕوو، خشتەك]

ف: چهار پهلو، شش پهلو.

ع: مُرَبَّع، مُكَعَّب، مُجسَّم.

وێنە

**چوارپاڵوو**

[(ك: بەردی ڕێکوپێکی بەنایی.)]

ف: چهار پهلو. (سنگ چهار پهلوی بنایی)

ع: رَضم، رَضمَة، رِضام، رَصاصَات.

**چوارپایە**

[ك: مێزی چوارپێچکە.]

ف: چهارپایه، چارپایه.

ع: مِشجَب، مِشجَر، مِرقَع.

وێنە

**چوار پەل چەرمگ**

[ك: دەست و پێ سپی (ئەسپ)]

ف: چهار پا سفيد. (اسپ)

ع: مُجَبَّب، مُحَجَّل.

**چوار پەل قەوی**

ك: کەتوکوڵوفت، زەلام.[زەبەلاح (مرۆڤـ یا ئاژەڵ.)]

ف: گُنده، كُلُفـت، چهارشـانه، كلفـت آفـرينش. (انسان يا حيوان)

ع: رَبع، رَبَع، رَبْعَه، حِنزاب. (غَليظُ الألواح)

**چوارتاقی**

ك: گومەز سەر گۆڕ.[هەیوانی گومەزداری سەر قەبر.]

ف: گوراب، گورابه، ستودان، استودان، چارتـاق، چهارتاق.

ع: رَواق، اُسطُوان.

وێنە←تاق

**چوارچوار**

[ك: چوار ـ کەس یا شت ـ لە دوای چوار.]

ف: چهارچهار، چارتاچارتا.

ع: رُباع.

**چوار چوار**

ك: شانزە.[چوار کەڕەت چوار، ٤×٤]

ف: چهـار چهـار، چـار چـار، چـار بـار چـار. (شانزده)

ع: أربَعَةُ أربَع.

**چوارچەقەڵ**

ك: چوارهەنگوڵە.[دەفری چوار دەسکە. هەروەها ئیدیۆمـە لە دەسەوسان بوون و بێهێزی.]

ف: چهارپا، چهاردست و پا.

ع: اَربَعَة قَوائِم. تَبَركُع، اَلْقِيامُ علی الْاَربَع.

**چوارچێوە**

ك: سكف.[ئەو چوار دارەی کە شتێکیان لە خۆ گرتووە. (وەك: چوارچێوەی دەرگا یا تاوێنە.)]

ف: بَلَند، بَلَندين، دَریواس، سُفت، چَهارچوبە.

ع: اِطار، بَرواز، حِتار، كِفاف. (اِطارُ الدُّرب، اِطارُ الْمرآة)

وێنە ← پەنجەرە/ وێنەی تری هەیە.

**چوارخرت**

ك: بەختە.[(بزن یا مەڕی چوار ساڵە.)]

ف: بَختە. (بُز یا گوسفند چهار سالە)

ع: جَذَع، مُربِع.

**چوار رۆکن**

ك: چوار دیوار.[چوار لای کەعبە: روکنی یەمانی، شامی، عێراقی، حەجەرولئەسوەد.]

ف:، چهار دیوار، چهارسو.

ع: اَركان اَربَعَة.

**چواررِیان ← چوارڕێکان**

**چوارڕێکان**

ك: چوارڕیان.[پێگەی دوو ڕێگەی یەکتربڕ.]

ف: چهار راه، چهار راهە.

ع: مَفرَق، مُلتَقی الطَّرِيقَين.

**چوارزربە**

ك: چوارقەمچ.[(تاشینی ریش و سمێڵ و ئەبرۆ و برژانگ) بۆ ئەتك كردن.]

ف: دَك، دَغ. (چهار ضرب: ریش، ابرو، سبیل، مژە. «دكزدە» یا «چهار ضرب»زدە یعنی: هر چهار را تراشیدە باشد.)

ع: اَشعار اَربَعَة. حَلقُ الْاَربَع.

**چوار زەربە ← چوار زربە**

**چوار سروشت**

[ك: چوار سروشتەکە: ئاو، ئاگر، خاك، با.]

ف: کیا، کیان.

ع: طَبائع اَربَعَة.

**چوارسوو**

ك: چوارگوزەر.[(ئەو تاقەی کەوتووەتە نێوان چوار تاریکە بازاڕەوە.)]

ف: چارسو، چهارسو. (تاقی کە چهار گذر از آن جدا شود.)

ع: مُلتَقی الْاَسواق.

**چوارسووچ**

ك: ... چوارگۆشە.[چوار کونج]

ف: چهار کُنج. چهارگوشە.

ع: زَوايا اَربَعَة. ذو اَربَع زَوايا. مُرَبَّع.

**چوارشانە**

ك: کوڵەپرە، کەتوکڵفت.[زەبەلاح]

ف: چهارشانە، چهارخویە، گُندە، کَتوکلفت.

ع: رَبع، رَبَع، رَبعَة، مَربُوع، وَراء. حنزاب. (غَلیظُ الْاَلْواح)

**چوار شەش**

[ك: چوار لە شەش.]

ف: چار شش، چهار شش.

ع: اَربَع سِتّة.

**چوارشەمە**

[ك: چوارشەم]

ف: چارشنبە، چهارشنبە.

ع: اَربَعاء

**چوار فەسڵ**

ك: چوار گا، چوار سا.[چوار وەرز]

ف: چهار هنگام، گُشاد هنگامان.

ع: فُصُول اَربَعَة.

**چوارقوڵفی**

[(ك: قازان یا گوڵدانی چوار دەسك.)]

ف: چارگوشی. (دیگ یا گلدان کە چهار دستە

داشته باشد.)

ع: ذُو اَربَع عُرُوات.

وێنەی هەیە.

**چوارقەمچ← چوارزربە**

**چوارگوزەر← چوارسوو**

**چوارگۆشە**

ك: چوارسووچ.[چوار کونج]

ف: چهارگوشه، چهارکُنج.

ع: مُربَّع، ذو اَربَع زَوايا.

**چوارلا**

ك: چوارلانە، دووباد.[بەنی چوار لۆ، بەنی دوو جار بادراو.]

ف: چهارلا، چهارتاه، چهارلای، چهاررشته، دوباد.

ع: مُربَّع، مَربوع، ذُو اَربَعَة خيوط، ذو اَربَعَة اَسلاك.

**چوار لا**

[ك: چوار تەرەف]

ف: چَهار سو.

ع: جِهات اَربَعَه.

**چوارمەشقان**

ك: چوارزرانی.[چوارمشقی: جۆرە دانیشتنێکە.]

ف: چهارزانو.

ع: رَوبَعَة، اُربُعاء، تَربُّع.

وێنە

**چوارمێخە**

[(ك: هەر چوار پەلی مرۆڤ ـ بۆ نموونە ـ ببەستنەوە بە چوار مێخەوە تا بە هیچ لایەکدا نەجوولێتەوە.)]

ف: چهارمیخ، چارمیخه. (چهار دست و پای انسان را مثلاً به چهار میخ ببندند که به هیچ طرف تکان نخورد.)

ع:...

**چوارناڵ**

ك: غار، تاو، چوارە.[پرتاو: غاردانی توند.]

ف: چهارنَعل، تاخت، دَو.

ع: خَبّ، خَبَب، كَردَحَة، هَملَجَة.

**چوارە← چوارناڵ**

**چوار هەنگڵ**

ك: چوارهەنگوڵ.[چوار دەسکە (وەك: چوار دەسکەی خێگە یا مەشکە.)]

ف: چهار دست. (چهار دست خیک، یا مشک مثلاً.)

ع: قَوائِم.

**چوارهەنگوڵ← چوار هەنگڵ**

**چوارهەنگوڵە**

[(ك: ئیدیۆمە لە بێهێزی و دەستەوسان بوون لە کاردا.)]

ف: چهار دست و پا. (کنایه از عاجز شدن و واماندن در کار است.)

ع: تَبرَکَع.

**چواریەکبەر**

[ك: ئەو کەسەی لە چوار بەش یەك بەشی بەردەکەوێت. (بۆ نموونە: لە بەروبوومی زەویدا.)]

ف: چهاریکبَر.

ع: مُخابِر، مَن لَهُ الرُّبع.

**چۆبەچۆ**

ك: بەرانبەر.[وەك یەك، یەکسان]

ف: برابر، یکی‌بودن، مانند هم.

ع: مُساوي، مُطابِق، طابَقَ النَّعلُ بِالنَّعلِ.

**چۆپی**

ك: هەڵپەرکێ، هەڵپەڕین.[دیلان (سەمای بەکۆمەڵ، کە چەند کەس پێکەوە بە شێوەیەکی بازنەیی یا کەرانەیی دەستی یەکتر دەگرن و هەڵدەپەڕن.)]

ف: پَنزه، پنجه، چوپی. (رقص اجتماعی، که چند نفر با هم به شکل دایره یا نیم دایره دست همدیگر را گرفته می‌رقصند.)

ع: زَفن، فَنزَج، فَرتَج، رَقص، دَعكَسَة.

**چوتورمه**

ك: تەوەرە.[کارەسات]

ف: آسیب، موژه.

ع: حادِثَة، صَدمَة، نائِبَة، نازِلَة.

**چوخور**

ك: چەم، ڕوخانە.[ڕوبار]

ف: رود، زوغ، رودخانه.

ع: وادِي، نَهر، مَنهَر.

**چۆخە**

[ك: چۆغە]

ف: چوخا، جولَخ.

ع: جوخَه، جولَق.

وێنە ‹٢›

**چوڕ**

ك: چەرمگی. (چوڕ شیر.)[سپیایی]

ف: سفیدی. (رنگ شیر)

ع: قُمرَة، بَیاض.

**چوڕ**

ك: واوێژ. (چوڕی داوە.)[وەڵام]

ف: پاسُخ.

ع: جَواب.

**چوڕ**

ك: ڕنە. (چوڕ کردن) [لێگیربوون (لێبەنبوون)]

ف: بَند. (بَند کردن، بَند شدن)

ع: اَخذ، جَرّ.

**چۆڕ**

ك: قوم، تك، تــۆز، نــەخت، کــەم، چــك، ڕێــزە، چــۆڕتك.

[دڵۆپ. نەختاڵ]

ف: چک، تک، ریز، شُر، شُرتک.

ع: جُرعَة، دُفعَة، حُسوَة، قُذمَة، غُمجَة، غَمجة، نَغبَة، شَربَة، قَطرَة، بَرض، ذُفّ، ذُفاف، شُفافَة.

**چۆڕ**

[ك: تنۆك] (چۆڕی لێبڕی. ئاوچۆڕی کرد.)

ف: شُر.

ع: رَشحَة، قَطرَة، وَشلَة، تَرَشُّح، تَقَطُّر.

**چۆڕ**←**شەق** [(وشەیەکی گۆرانیە.)] (گورانی است.)

**چۆڕ**←**قەرقاوڵ**

**چورت**

ك: پینەکی، وەنەوز.[خەوبردنەوە]

ف: چُرت، پینَکی، ناو، ناویدن.

ع: سِنَة، سُبات، نُعاس، دُکاس، مُواد، نَود، نَوَدان، وَسَن، غَفوَة، هَوجَل.

**چورت**

ك: چورتکە.[چۆرت (ئامرازی ژمێرە)ی جاران.]

ف: چُرت، چرتکه. (چرتکه‌ی حساب)

ع: شُرط.

**چورتاندن**

ك: تــرازانــدن.[ترازانــدن، چــرکاندن (وەك: چــرتاندنی پەلەپیتکەی تفەنگ.)]

ف: چُرتاندن، درکردن. (ماشه‌ی تفنگ را مثلاً چرتاندن.)

ع: اِزلاق، تَنحِیَة.

**چۆڕتك**←**چۆڕ** (کەم)

**چورتیان**

ك: ترازیان.[ ترازان، چرکان]

ف: چُرتیدن، دررفتن.

ع: اِنزِلاق، تَنَحّي.

**چوڕ کردن**

ك: ڕنە کردن، بەنبوون.[لێگیربوون]

ف: بَندشدن، بَندکردن، نیزه‌بند کردن.

ع: اَخذ، جَرّ.

**چورژ**

[ك: چەرەس]

ف: لَب‌چِره، لَب‌چَرا.

ع: لَماظ، لَماق، لُمجَة، عُقبَة. التِماظ.

**چۆڕە**

ك: شوڕە.[(دەنگی رژانی ئاو.)]

ف: شُره، شُریدن. (صدای شرشر آب)

ع: اِنصِباب.

**چۆڕەچۆڕ**

ك: شوڕەشوڕ.[چورچور، چۆڕەی زۆر]

ف: شُرشُر، شُریدن.

ع: تَصَبُّب، وَشَلان.

**چۆڕێ**

ك: تکێ، تۆزێ، چکێ، کەمێ، ریزەیێ.[تنۆکێك، تۆزقاڵێك]

ف: شُری، تَکی، چِکی، کمی، ریزی.

ع: جُرعَةً، شَربَةً، غُرفَةً، نَغبَةً، قَطرَةً.

**چۆڕیان**

ك: تکیان.[تکان، چکان، پاڵێوران]

ف: شُریدن، چَکیدن، سوداب، پالیدن، پالان‌شدن، آب‌چکان.

ع: وَشل، تَصَبُّب، تَقَطُّر.

**چۆش!**

ك: ورش!، وەش![هۆش! (فەرمانە بۆ راوەستانی کەر، بە پێچەوانەی «چش»ەوە.)]

ف: چش!، وش! (امر به ایستادن الاغ، برخلاف «چش!».)

ع:...

**چۆق**

[ك: مژ (مژ دان لە نێرگەلە.)]

ف: پُک. (نفسی که به قلیان می‌زنند.)

ع: نَشق، نَشَق، تَنَشُّق، اِستِنشاق.

**چۆقانن**

[ك: لەرزاندن، دانەچوقە پێکردن] (یاو ئەیچۆقنێ.)

ف: چَکاندن، ژکاندن.

ع: صَلق، نَفض، اِرعاد، اِکزاز.

**چۆقە**

ك: کزە.[سووتانەوە، کزانەوە]

ف: سوزش.

ع: حُرقَة، اِلتِهاب.

**چۆقە**

[ك: دانەچوقە (تەقەتەقی ددان بە هۆی سەرما یا لەرزوتاوە.)]

ف: چَک‌چَک، ژَک‌ژَک، ژَغ‌ژَغ، (صدای به هم خوردن دندان از سرما یا از تب و لرز.)

ع: رِعدَة، نُفضَة، کُزاز، صَلقَمَة. (صَریر، صَریف)

**چۆقەی‌دڵ**

ك: کزەی‌دڵ. کورکیان، کوڵەی‌دڵ.[ئەوپەڕی تاسە.]

ف: سوزش‌دل. درخوش، شادخواست.

ع: حُرقَة القَلب. اِشتِیاق.

**چۆقەی دیان←چۆقە** [(مانای دووەم.)] (به معنی اخیر «چوقه» است.)

**چۆقین**

[ك: کەوتنە دانەچوقە، تەقەتەق کردنی ددان.]

ف: چکیدن، ژکیدن.

ع: تَصَلُّق، اِرتِعاد، اِنتِفاض، اکتِزاز.

**چۆك**

ك: زرانی، رژنگ.[ئەژنۆ]

ف: چُک، چوک، زانو.

ع: رُکبَة.

**چۆك‌دان**

ك: سەردون.[لەسەر ئەژنۆ دانیشتن.]

ف: چُک، چوک، چُک‌دادن، زانودادن، به زانونشستن.

ع: جُثُوّ، تَجاثی، قُفوف، حَلَب، اِکتِیام، تَحَفُّز.

وێنە

**چوکلە**

ك: چیکلە.[چیلکە]

ف: دروک، دسوک، خلاشە.

ع: سُجُور، هَشیم.

**چوکلەخیکە**

ك: پۆگ، پشك.[ئەو چیلکەیەی خیگەی پێ پینە دەکەن.]

ف: چوبَک، چوبَک خیگ.

ع: زاجِل، اُسکوبَة.

وێنە ‹٢›

**چوکلەشکێن**

ك: خومەشێونە، بشێونەیی.[دووزمان، ئاژاوەچی]

ف: هالە، چُغُل، سخن‌چین، دوبرهم‌زن.

ع: هَمّان، نَمّال، نَمّام، نامِل، دَیبوب، مُفَتِّن، مُفسِد.

**چوکلەشکێنی**

ك: خوم شێوانْن، بشێونەیی.[فیتنەیی، دووزمانی]

ف: هالگی، چُغُلی، سخن‌چینی، دوبرهم‌زنی.

ع: هَمز، هَمازَة، نَمل، اِنمال، نَمیلَة، نَمیمَة، نَزغ، افساد، تَفتین، اثایة. سِعایَة.

**چوکلەی ئەماکو**

ك: دەمار.[رەگی تووتن]

ف: دَمار، چوبە.

ع: عَصَبُ التَّبغ، عُرُوق التَّبغ.

**چوکلەی قولاپ**

ك: خەمازە، چوکلەی ماسیگیر.[(چیلکەی قولاپی ماسی‌گرتن.)]

ف: غمازک. (چوبک قلاب ماهی‌گیری)

ع: ...

وێنە

**چوك‌هەلدان**

[ك: دانیشتن لەسەر یەك ئەژنۆ (و بەرزکردنەوەی ئەژنۆکەی تر.)]

ف: زانوبلندکردن، زانو. (یک زانو بلند کردن)

ع: تَثَنّي، ثُنّي‌الرُّكبَة.

وێنە

**چوك‌هەلدان**

ك: جنچکان، قنچکان.[چیچکان (بەرزکردنەوەی هەردوو ئەژنۆ و لەسەر پێ دانیشتن.)]

ف: چُنباتمە، زانوافراشتن. (هر دو زانو افراشتن و بر پا نشستن.)

ع: قُرفُصاء، قَرفَصی، قَعفَزی، اِقعِنفاز، اِحتِباء، اِحتِفاز، اقعاء.

**چولەکە←مەلیچك** [(وشەیەکی کرماجیە.)](کرماجی است.)

**چۆڵ**

ك: بیاران.[بیابان، سارا (زەوی خاڵی لە مرۆڤ.)]

ف: کَویر، گَویر، هامون، بیابان، چول. (زمین خالی از مردم.)

ع: قَفر، قارَّة، مَفازَة، وَحش، صَحراء، تَیهاء، بَیداء.

**چۆڵ**

ك: ئاواق.[خاڵی (خانووی خاڵی)]

ف: تهی. (خانەی خالی.)

ع: خالي، خاوِي، خافِق، غامِر، بائِر، مُخَلّی، خالي السَّكَنَة.

**چۆڵای بو؟**

ك: چۆن ئەوێ؟ [کوو دەبێت؟]

ف: چەجورشد؟، چەجورمی‌شود؟

ع: کَیف؟، کَیف یَکُون؟

**چۆلبڕ**

ك: بێڕێگە.[لاڕێ]

ف: بی‌راهە، بیابان‌رَو.

ع: تَعَسُّف.

**چۆلچڕ**

[(ك: گۆرانیەکی بەناوبانگ و تایبەتی بیابانە کە هاوواتای فارسی و عەرەبی نیە.)]

ف: آوازی است معروف مخصوص بیابان

مرادف فارسی و عربی ندارد.

**چولسك**

ك: چڵۆسك، کوتەرە، چلاسك.[داری نیوە سووتاوی گڕدار.]

ف: سُغده، آسغده، نیمسوز، نیم‌سوخته.

ع: جَذوَة، قَبَس، وَقُود، مِسعار.

**چولوهۆل**

ك: خوتوخوالآ.[بێ‌ئاوەدانی (خاڵی‌وهەواڵی.)]

ف: تهی‌وتَهَک. (خالی و خوله)

ع: خالي، فارغ، خالي السَّكَنَة.

**چوڵەچرا**

ك: سوڵەچرا، چوکڵەچرا، شەوچرا.[(لقی درەخت ـ وەك: داربەڕوو ـ کە بە پشتی تەشوێ وەك سیواك دەیکوتن و بۆ راو ـ وەك: راوەکەو ـ لە چیا و دەشتدا هەڵیدەگرسێنن.)]

ف: شوله‌چراغ، هاله‌چراغ. (شاخه‌ی درخت بلوط را مثلا با پشت تیشه مانند مسواک می‌کوبند و برای شکار کبک مثلاً در کوه و بیابان روشن می‌کنند.)

ع: قُبّار. عُشوَة.

وێنە

**چوڵی**

[(ك: گەڵای مێو یا کاهوو کە بە «با»ی دەست کونی دەکەن و وەك دەمانچە دەنگی لێوە دێت.)]

ف: چولی. (برگ مو، یا برگ کاهو را با باد دست سوراخ می‌کنند که مانند تپانچه صدا می‌دهد.)

ع: فَقَع، تَفقيع.

وێنە

**چون**

ك: وەك، وێنە، جۆر، جفت.[چەشن، هاوتا]

ف: چون، مانند.

ع: شِبه، شَبيه، مِثل، مَثيل، نَظير، عَدِيل.

**چون←چونکە**

**چونکە**

ك: چون.[چونکو، لەبەر ئەوە]

ف: چون، چونکه.

ع: اِذ، اِذاً، لاَنَّ.

**چونوور**

ك: چنوور (گیایەکی بەناوبانگە.)

ف: علفی است معروف.

ع: ...

**چونەر**

[ك: چەوەندەر]

ف: چُندَر، چُغُندَر، چُقُندَر، چُگُندَر، شُوَندَر.

ع: سِلق، شَمَندَر، شَوَندَر، شَمَندوَر.

وێنە

**چونەربریانی**

[ك: چەوەندەری لێنراو.]

ف: لَبو، لبلبو، چُغُندَر پُخته.

ع: سِلق، شَوَندَر، لَبو.

**چونەر قەن**

[ك: چەوەندەری شەکر]

ف: چُغُندَر قند.

ع: شَوَندَر، شَمَندَر، شَمَندور، سِلقُ السُکَّر.

وێنە

**چونەر و کەشك**

[ك: چەوەندەر و کەشك]

ف: لَبو، چُغُندَر و کَشک.

ع: لَبلَبو.

**چووپ**

ك: درۆ، چاپ.[درۆ]

ف: دروغ. (چاپ و چوب)

ع: کَذِب، فِرية، کِذب.

**چووز**

ك: چووزە، چەکەرە.[چەقەرە (پیاز، گیا یا پەڕی مریشك کە تازە سەری هێنابێتە دەر.)]

ف: نیش، تُنزه. (پیاز یا گیاه یا پر مرغ که تازه سر درآورده باشد.)

ع: شَطأ، بارِض، وَشم، نَتش، خامة، فرخ.

**چووز**

[ك: ریز (ئەو سێ بەردەی دەکەونە سەر یەك هێڵ. زاراوەیەکە لە یاری «ریزێن»دا.)]

ف: چوز، ریز. (واقع شدن سه ریگ در یک رج، اصطلاح بازی «چووزان» است.)

ع: قَرف.

وێنە←چووزان

**چووزان**

[ك: ریزێن: یاریەکە.]

ف: چوزان، ریزبازی، ریگ‌بازی.

ع: قَرف، قَرَق.

وێنە

**چووزە**

ك: وەچ.[(هەر بەشێکی رووەك کە پیر نەبووبێت.)]

ف: تژ، تژه. (هر چیز جوان از نباتات که پیر نشده باشد.)

ع: والِیَة، نَشیئَة، حَقل.

**چووزە←چووز (چەکەرە)**

**چووزەپونگە**

[(ك: پنگی نەپشکووتوو)]

ف: چوزەپودنه، پودنەی تنزه. (پودنەی نشکفته)

ع: شَطأ الفودَنج.

**چووزەخەیار**

[ك: هاروێی ناسك.]

ف: خیارزه، خیار تازه، خیار نازک.

ع: شُغرُور.

**چوون**

ك: ڕوین، شوون.[ڕۆشتن]

ف: رَفتن، شُدن.

ع: ذِهاب.

**چوون**

ك: کەفەڕێژ.[سەرڕێژکردن (وەك: کەفەڕێژ کردنی چێشت.)]

ف: ازسررفتن. (آش مثلاً.)

ع: قَزح، اِزباد، تَنافُط، تَغَلّي.

**چوون**

ك: کردن. (لەوەنەچێ= لەوە نەکا.)[وێچوون، هاوشێوەیی]

ف: ماندن. (به آن می‌ماند.)

ع: شَبَه، شَباهَة، اِشباه، مُشابَهَة، مُماثَلَة، مُثُول.

**چوونبەیەکا←بەیەکاچوون**

**چوون ناو ئاو**

[ك: ڕۆچوون لە ئاودا.]

ف: رفتن توی آب.

ع: خَوض.

**چوونەیەك**

[ك: هاتنەوەیەك یەك (بۆ بازدان.)]

ف: به هم‌رفتن. (برای جَستن.)

ع: قَزّ، اِنقِباض، اِنقِفاش، اِکلِئزاز، قَذقَذَة.

**چوونەیەك**

ك: ... هەڵپێکیان.[لێك توند بوون. هاتنەوەیەك]

ف: درهم‌رفتن. بسته‌شدن. برآمدن.

ع: عَجَر. رَتق. قُلوص، تَقَبُّض، تَقَفُّص، تَجَمُّع. تَشَنُّج.

**چوونەیەك**

[ك: کرژ بوون(ی داو، کیسە، لاستیك ...)]

ف: بُلغُشته‌شدن. (دام یا کیسه یا لاستیک مثلاً.)

ع: قُلوص، اِجتِماع، تَجَمُّع.

**چ وەخت؟**

ك: چ گا؟ [چ کاتێك؟]

ف: چەگاە؟، چەهنگام؟

ع: اَيانَ؟، مَهما؟، اَيُّ وَقتٍ؟

**چوەر←ژوور** [(وشەیەکی گۆرانیە.)] (گورانی است.)

**چە**

[(ك: نیشانەی کورتەناوە، وەك: باخچە.)]

ف: چە. (علامت تصغير است. باغچە، تربچە.)

ع: ي.

**چە؟**

[ك: چی؟]

ف: چە؟، ژش؟

ع: ما؟

**چە نەوی؟**

[ك: چی ئەبێت؟]

ف: چە میشود؟.

ع: ما يَكون؟.

**چەبوونی←حەقیقەت**

**چەپ**

[(ك: بەرانبەری «راست».)]

ف: چپ. (ضد «راست»)

ع: يَسار، يَسرَة، اَيسَر، شِمال، شِيمال، شِملال.

**چەپ**

ك: چەپلە.[چەپك: دەست بە یەکدا کوتان.]

ف: خُنبَک، خُمَک، دَستَک، زنگ، شَقَق، دَستزَدَن.

ع: صَلد، سَطَع، صَدوَة، صُفقَة، تَبَلُّد، ضَربُ الْكَفِّ، (تَصفيح)، تَصدِيَة.

**چەپاڵە**

ك: شەپاڵە، شەپلاخە، زیلە.[زللە]

ف: سیلی، چِپات، تَپانچە، تَوانچە، سلَه، کَشیده.

ع: لَطم، لَطح، كَفخ، دَحّ، صَفعَة، صَفدَة، رَطسَة، طَبانجَة.

**چەپاڵە**

ك: چەپۆڵە، ناودەس.[چەپۆك (لەپی دەست.)]

ف: هَبَک، کَبَک. (کف دست)

ع: كَف، يَد.

**چەپانن←تەپانن**

**چەپاو**

ك: تالآن، برفێنبرفێن.[راپووت]

ف: چَپاو، چَپَو، چَپاول، تاراج، تارات، بچاپبچاپ.

ع: نَهب، نَهَب، غارَة، مَغار، اِغارَة، اِستغارَة.

**چەپخون**

ك: شەونغوون، شەوغوون.[هێرش کردن لە شەودا.]

ف: شَبخون، شَبیخون، شبتازی، شبتاختن.

ع: تَبييت.

**چەپك**

ك: چەپە، دەسە، دەسکە، چەپکە، قول.[بەستە، دەستە]

ف: دَستە، مُشتوارە.

ع: قَبضَة، قُصَّة، خُصلَة، حُزمَة، قَصِيبَة، سَبيخَة، غِبط، عَميثَة، جَزِيزَة.

**چەپ کوتانن**

ك: چەپلەکوتانن.[چەپلە لێدان]

ف: خُنبیدن، خُنبَکزدن، خمَکزدن، دَستَکزدن، دستزدن، شَقَقزدن.

ع: صَفق، تَصفيق، صَدو، تَصدِيَة، تَصفيح، تَبَلُّد، ضَربُ الْكَفِّ.

**چەپکە←چەپك**

**چەپکەگەنم**

ك: قول، دەسکە.[بەستەی گەنم، دەستەی گەنم]

ف: بَسک، بَسدَک، دستەی گندم.

ع: قَبضَة، حُزمَة، شِمال.

وێنە

**چەپکەن**
[ك: تونێل]
ف: رَه‌کَند، رَه‌گویه.
ع: نَفَق، سَرَب، دَیماس.
وێنە←تووێل

**چەپکەرد**
ك: چەرخ، ئاسمان، گەردوون.[چەپگەڕ، فەلەك]
ف: چَرخ، چَپگرد، آسمان، روزگار، گردون.
ع: فَلَك، سَماء.

**چەپلەر**
[ك: چوێە (کەسێك کە کار بە دەستی چەپ دەکات.)]
ف: چَپّه. (کسی که با دست چپ کار کند.)
ع: أعسر، (م: عسراء)

**چەپلەڕێزان**
[(ك: چەپلەلێدانی بە کۆمەڵ.)]
ف: خُنبَک زدن، خُنبَک‌زَنان. (کف زدن جمع)
ع: تَصافُق، تَصفیق، تَبَلُد، ضَربُ الکفوف.

**چەپوراس**
ك: چەلیپا.[خاچ]
ف: چلیپا، چپ و راست.
ع: صَلیبیّ، صَلیبا.

**چەپوڕاس**
[(ك: بڕینی دەست و پێ بە پێچەوانەی یەکترەوە.)]
ف: چپ و راست. (بریدن دست و پا بر خلاف.)
ع: اَلقَطعُ مِن خِلافٍ.

**چەپوڕاس←دۆمرەکێ**

**چەپۆك**
[(ك: بە لەپی دەست لە سەر دان.)]
ف: بام، توسَری. (با کف دست توی سر کسی بزنند.)
ع: کَفّ، صَكّ، صَعف، قَصع. رَبسَة، صَفع.

**چەپۆکان**
ك: چالاکی.[(هاروهاجی کردنی ئەسپ.)]
ف: چالاکی، هَرزگی. (هرزگی کردن اسپ)
ع: جَلافَة.

**چەپۆکەسەرێ**
[(ك: بە لەپی دەست لەسەر دان.)]
ف: توسَری. (با کف دست.)
ع: رَبس، قَصع، لَدم، لَفخ.

**چەپۆلە**
ك: پەنجۆڵە، پەنجە.[چەچە]
ف: چَچ، پَنجه، دَست.
ع: کَف، یَد. قُنب.

**چەپە**
ك: چەپک، چەپکە، دەسە، بەسە.[دەسکە]
ف: دَسته، بَسته، مُشتواره.
ع: قَبضَة، حُزمَة، قَصیبة، عَمِیتَة، سَبیخَة، خُصلَة، قُصَّة، غِبط.

**چەپە**
[(ك: سەری «پاشبەن» کە مەچەکی ئەسپی پێ دەبەستنەوە.)]
ف: مُچی. (سر پاشبند که به مچ اسپ بندند.)
ع: رُساغ.

**چەپە←دزە**

**چەپەجاخ←ساتوور** [(ڕشەیەکی کرماجیە.)] (کرماجی است.)

**چەپەر**
ك: هەسار.[(دیوار لە شووڵ و وشکەگیا وەك: تەیمان.)]
ف: چَپَر، تَواره. (دیواری که از چوب و علف سازند مانند «تەیمان».)
ع: عَریش، حِباك.
وێنە (۲)

**چەپەر**
ك: پۆس، پۆسە.[پۆستەچی، نامەبەر]
ف: چاپار، پَیک، اُلاغ، آسکدار، پُست، پوسته،

پوستەچی، راەنَوَرد، نامەبَر.

ع: بَرید، قاصِد، ساعي، فَیج، سِکَي.

**چەپەربەن**

ك: سینەبەن.[ملپێچ]

ف: باژرَند، باژرَنگ، سینەبند، شال‌گردن.

ع: لَبیبَە، تَلبیب، مِشْلَّة.

وێنە

**چەپەر خانە**

ك: پۆسـەخانە.[پۆسـتەخانە]

ف: چاپارخانـــە، پَیـــک‌خانـــە، پُـسـت‌خانـــە، پوستەخانە.

ع: مَرکَزُ الْبَرید.

**چەپەڵ**

ك: گەن، بەد، خراو. [خراپ (خراپە)]

ف: بد، گند، پلشت، پلید. (کار بد)

ع: قَبیح، شَنیع، فَظیع، سَيِّئ.

**چەپەڵ**

ك: چلکن.[پیس]

ف: چَپَل، پَچَـل، دَژَن، پَلیـد، ژیـژ، فـژە، فـژاک، فَژگند، چرکن.

ع: قَذِر، وَسِخ، رَجِس، نَجِس، دَنِس، دَرِن، کَثیـف، خَبیث، قَشِب، مُستَقذَر، حَرام، نکبة.

**چەپەڵ**

ك: بەدسرشت، گێڕ، چەفت.[چەوت، نارەسـەن]

ف: کَج، بدگوهر، بدسرشت.

ع: ملِط، فَظّ، مَرِید، شَرِیر، عِتریـف، خَبیـث، سَيِّئُ الْقَلب.

**چەپەڵ**

ك: گەنیگ.[گەنیو (وەك: هێلکەی پیس.)]

ف: بَلَغد، گنده، گندیده. (تخم مرغ مثلاً.)

ع: فاسِد، ضائع، مَذِر، مُنغِر، مُفرِخ، مُفَرِّخ.

**چەپەڵ**

ك: پاك نەکریاگ.[ناپوخت، نەبژێردراو (وەك: گـەنمی پـاك نەکراو.)]

ف: آلَغده، ناپاک، ناویژه، دَغَلدار. (گندم مثلاً.)

ع: غَلِیث، خَلِیط.

**چەپەڵ بوون**

[ك: پیس بوون]

ف: آلوده شدن. پلشت‌شدن.

ع: تَلَطُّخ. تَخَبُّث.

**چەپەڵکار**

ك: بەدکار، گەنەکار.[خراپەکار]

ف: بدکار، گندەکار.

ع: خائِن، خَبیث، عِتریف.

**چەپەڵی**

[ك: پیسی، ناپاکی]

ف: چَپَلـی، پَچَلـی، پَلیـدی، پلـشتی، فَژاکـی، وَژَنی. چرک.

ع: قَذارَة، کَثافَة، خَباثَة، رِجس، نَجَس، قَذَر، قَذَع. وَسَخ.

**چەپەڵی**

ك: گوو.[پیسـایی (لە پاش و پێشی مرۆڤەوە.)]

ف: گُه، پاچایه، وَژَن، پلیـدی، پلـشتی. (بـول و غائط)

ع: جَعر، قَذَر، نَجو، غائِط، مَدفوع، نَجَس، نَجاسَة.

**چەپەوانە**

ك: وارو، چەواشە.[پێچەوانە]

ف: باژگونـه، واژگونـه، وارون، وارونـه، رَخـش، بازگونه، باشگونه.

ع: مَعکوس.

**چەپی**

ك: چەپەوانە، وارو. (زیددی «راسی».) [پێچەوانە]

ف: چَپـی، وارو، وارون، وارونـه، رَخـش. (ضـد

«راستی»)

ع: یَسرَة، عَکس.

**چەپی**

[(ك: جۆرە هەڵپەڕکێیەکە.)]

ف: چوپی، چَپی. (نوعی از چوپی است.)

ع: زَفن، دَعکَسَة.

**چەتاڵ**

ك: دووشاخە.[(کۆڵەکەی پێشەوەی چادر کە سەرەکەی دوو لق بێت.)]

ف: چَتال. (ستون جلو خیمه که سرش دوشاخه باشد.)

ع: دِعامَة.

وێنە←چادر، دووشاخە

**چەتر**

[ك: سەیوان]

ف: چَتر، مَنجوق، آفتابگیر، آفتابگردان.

ع: شَمسِیَّة، ظُلَّة، مِظَلَّة، عالَة، سُعنَة.

وێنە

**چەتر**

ك: بیکوڵ.[لقە داری هەڵپاچراو]

ف: سربُریدە.

ع: غَریسَة. مُشَذَّب.

**چەتر کردن**

[(ك: هەڵپاچینی لقوپۆپی زیادەی درەخت.)]

ف: چَتر کردن، پاچیدن. (شاخەهای زیادی درخت را بریدن)

ع: جَزّ، تَشذیب.

**چەتر کردن**

ك: گژ کردن.[خۆ فش کردن (وەك: چەتر هەڵدانی تاوس.)]

ف: چترکردن، فیسکردن. (مانند طاووس مثلاً.)

ع: تَنَفُّش، تَطَوُّس.

**چەتفە**

ك: چەفیە.[دەسماڵی سەر.]

ف: چفیه.

ع: کَفِیَّة، کُوفِیَّة.

وێنە

**چەتفە و ئەگاڵ**

[ك: دەسماڵ و سەرپێچی سەر]

ف: چَفیه و اگال، چَفیه و عَکّال.

ع: کَفیة و عِقال، کُوفِیَة و عِقال.

وێنە←ئەگاڵ

**چەتوون**

ك: ناهاڵ، نارِاس، شەیتان.[تووش، نارەسەن]

ف: شَیتون، هُرماس، نادرست.

ع: مُتَقَلِّب، خَوّان، شَیطان.

**چەتوەر**

[(ك: پارەی زیوینی زریرەدار.)]

ف: چَتوَر، چَتوَری. (پول نقرەی زنجیره دار)

ع: قِران، دِرهَم.

**چەتە**

ك: جەردە، رازەن، دز.[ڕێگر]

ف: رَەزَن، دُزد.

ع: لِصّ، قاطعُ الطَّریق.

**چەتە**

ك: قەرەسوڕان، دزگیر.[ژاندارمی جەردەگر.]

ف: قَرەسوران، دُزدگیر.

ع: اَمنِیَّة.

**چەچ**

ك: دەس، پەنجە، چەچلە.[چەچە (لەپی دەست.)]

ف: چَچ، دست. (کف دست)

ع: یَد، کَف.

**چەچلە**

[(ك: بچووك‌كراوەی «چەچ»x.)]
ف: مصغّر «چەچ» است.

**چەخماخ**

ك: ئەستێ.[ستە، ستێ، چەخماخ]
ف: چَخمـاخ، چَخمـاق، چقمـاق، فروزینـه، آتَش‌پَرَک، آتَش‌زَنه.
ع: زَند، قَدّاح، قَدّاحَة، مِقداح.
وێنە

**چەخماخ**

ك: ماشە. (چەخماخ تفەنگ.)[پەلەپیتکەی چەکی گەرم.]
ف: چخماخ، ماشه.
ع: كَلبَة.
وێنە←تفەنگ‹٢›

**چەخماخە**

ك: برووسکە.[تریشقە]
ف: بیر، درَخش، آدرَخـش، آذرَخـش، سَـیَنجُر، اَرتَجَک.
ع: بَرق، صاعِقَة، سَلَنقَع. اِئتِلاق، لَمَعان.

**چەرا**

ك: لەوڕ. چەرین.[لەوەڕگە. لەوەڕین]
ف: چَرا. چراگاه، چَریدن.
ع: رَعي، رَتع، مَرتَع، مَرعی.

**چەرلگا**

ك: لەوەڕ، وێرت، یۆرت.[لەوەڕگە]
ف: چَرَس، چَرام، چرامین، چَراخوَر، چراخوار، چَراگاه، یورت.
ع: مَرعَی، مَرتَع، مَرعاة. حِمَی.

**چەراتن**

ك: لەوەڕاتن.[ئاژەڵ بردنە دەشت بۆ ئالف خواردن.]
ف: چَراندن.
ع: رَعي، رَتع.

**چەربیان**

[ك: زیایی، زیادی]
ف: چشک، چَربیدن، افزونی.
ع: فَضل، تَفَضُّل.

**چەرچی**

ك: ڕووتچی، ڕوتسێن.[ڕووتکر]
ف: چَرچی، چَربچی، روغنچی.
ع: دَهّان، دَسّام.

**چەرخ**

ك: خول، گەڕیان.[سووڕ]
ف: چرخ، چرخه، گردیدن.
ع: دَور.

**چەرخ**

ك: ئاسمان، چەپگەرد، گەردوون. [فەلەك‌چەپگەڕ]
ف: آسمان، چَرخ، گَردون.
ع: فَلَك، سَماء.

**چەرخ**

ك: ئەڕابە. خرتەك.[عارەبانە. پێچکە. تایە]
ف: چَرخ، گَردون، گَردونه، گَرده، غَرده. غَلتَک.
ع: بَكَرَة، عَجَلَ، عَرَبَة، عَرَبانَة، عَرّادَة، اَرّادَه، دولاب، فلكة، فَلَكَة، غلطَة.

**چەرخ**

ك: پێچکە.[ئـامێر، مەکینـە (وەك: ئامێرگـەلی دروون و چنین و گوشین و...)]
ف: چَرخ، دولابه. (انواع چـرخ‌هـای خیـاطی و نساجی و عصاری و غیرها...)
ع: بَكَرَة، عَجَلَة، عِجلَه، دُولاب.

**چەرخ**

ك: باڵەوان.[شاهێن (باڵندەیەکی ڕاوچی بەناوبانگە.)]
ف: چَرخ، چَرغ، شاهین. (مرغی اسـت شـکاری معروف.)
ع: صَقر، سَقر، قِطام، زُمَّج، شاهین.
وێنە

**چەرخانن**

ك: گەڕانن، خولدان. پێچدان.[سووڕدان. بادان]

ف: گرداندن، چَرخاندن. پیچاندن.

ع: اِدارَة، لَـوي، حَـرف، صَـرف، عَطـف. بَـرم، اَزم، جَدل.

**چەرخ خواردن**

ك: چەرخیان، خولخواردن.[سووڕانەوە]

ف: چَرخیدن، چرخ‌خوردن.

ع: دَورَة، بَرمَة، تَدوُّر، تَبَرُّم.

**چەرخ دەزگ هەڵکردن**

ك: پارەهەڵکەر، دەزگەهەڵکەر، خوێگل.[ئامێری کلاّفەگر.]

ف: جَهره، چَرخه، کلافه، کلابه.

ع: حَلّالَه، دُولاب.

وێنە← پارەهەڵکەر

**چەرخ شیرەچی**

[ك: ئامێری ڕۆن گرتن.]

ف: گراووش، چرخ‌روغنگری.

ع: دُولابُ العَصّار.

**چەرخ مووتاوی**

[ك: ئامێری مووڕێسی.]

ف: چرخ موتابی.

ع: بَکَرَة، دَرّارَة.

**چەرخە**

ك: چەپکەن.[تونێل]

ف: چَرخه، زاغه‌ی‌پیچ، راه‌زاغه.

ع: نَفَق.

**چەرخە**

ك: خول، گێچکە.[سووڕ (برای «تەسەلسول»[1].)]

ف: چرخ، چرخه. (برادر تسلسل)

ع: دَور.

**چەرخ هەورێشم**

[(ك: ئامێزی ڕستنی هەورێشم.)]

ف: پَروان، پَروَن. (چرخ ابریشم تابی)

ع: بَکَرَة.

**چەرخی**

ك: گرد.[خڕ]

ف: گرد، چَرخی.

ع: مُدَوَّر.

**چەرخی**

[ك: هەرشتێکی ساف و خڕکراو (وەك: مسی خڕکراو.)]

ف: چَرخی. (مس چرخی)

ع: تَدویری.

**چەرخیان**

ك: گـەڕیان، خولیـسان، خولیانـەوە، چـەرخ‌خـواردن، خولخواردن. [سووڕانەوە]

ف: چَرخیدن، گَردیدن، چَرخ‌خوردن.

ع: دَوَران، تَـدَوُّر، اِسـتِدارَة، اِدارَة. اِلتِـواء، اِنحِـراف، اِنعِطاف، اِنصِراف.

**چەردە**

ك: بام، تاڵە، ڕەنگ. (سیاچەردە)[ئامال، مەیلەو]

ف: چَرده، چَرته، فام، رنگ. (سیه‌فام)

ع: لَون. (یَضرِبُ اِلَی السَّواد.)

**چەرس**

ك: بەنگ، بەرش.[ حەشیشە]

ف: چَرس، بَرش، بَنگ.

ع: حَشیش، وَرَقُ الْخِیال.

**چەرم**

ك: ... پۆس. (خوەشەکریاگ) [(پێستی دەباخی کراو.)]

ف: چرم. پوست.

ع: اَدیم، جِلد، سِبت، صَرَم. (اِهاب)

**چەرمچی**

١- «دەور» و «تەسەلسول» دوو زاراوەی زانستی فەلسەفە و کەلامە.(ر ـ ر)

ك: پێس‌خوەشەکەر، چەرم‌خوەشەکەر.[دەباخچی]
ف: چرمچی، چرمگر، پوست‌پیرا.
ع: دَبّاغ، صَرّام.

**چەرم خوەشەکریاگ**
[ك: پێستی دەباخی‌کراو]
ف: چرم پیراسته.
ع: سِبت، اَدیم، جِلد مَدبوغ.

**چەرم خوەشەکەر←چەرمچی**

**چەرم کوناێ چادر**
[ك: چەرمی کونی وەك قوڵفە کە دەیدروون بە خێوەتدا.]
ف: پَشیز، پَشیزە.
ع: عُروَة.

**چەرمگ**
ك: سفی، سپی.[چەرمور]
ف: سفید، سپید، سپی، اسپید، خِنگ، ساچی.
ع: اَبیَض، اَمرَة، اَقمَر، اَلهَق، اَمهَق.

**چەرمگەوبوون**
ك: رۆشـنەوبـوون، ئاشـکرابـوون.[روون بوونـەوە (وەك: ئاشکرابوونی بابەتێك.)]
ف: سـفیدشـدن، روشـن‌شـدن، آشـکار شـدن. (مطلب مثلاً.)
ع: ظُهُور، وُضُوح، تَبَیُّن.

**چەرمگی**
[ك: سپێتی]
ف: سفیدی، سپیدی.
ع: بَیاض، مُرهَة، قُمرَة، لُهقَة، مُهقَة.

**چەرمگی بنێخ ناخون**
[ك: سپێتی کەوانەیی بنی نینۆك.]
ف: ملک. (سفیدی بن ناخن)
ع: ثُور، کَذَب، وَبَش، وَبش، نُدغَة، نُمنُم، حِقاب.

**چەرمگی چاو**
ك: چەرمێنەی چاو.[سپێنەی چاو]
ف: سفیدی چشم.
ع: مُقلَة، شَحمَةُ العَین.

**چەرمگی ناوچاو**
ك: چەرمگی توێڵ، چەرمگی نـاوتوێـڵ.[سـپێتی ناوچـەوان (وەك: سپێتی ناوچاوی ئەسپ.)]
ف: سفیدی پیشانی. (اسپ مثلاً.)
ع: غُرَّة، غُرغُرَة، شادِخَة.

**چەرمەسەرێ**
[ك: تەمێ کردن.]
ف: سَرزَنش، توسَری. شلاخ‌کاری. چوب‌کاری.
ع: تَادیب، تَعزیر، حَدّ.

**چەرمەڵانە**
[ك: سپی‌پێست، سپێتی]
ف: سفیدی، سفیدرنگ، سفیدپوست.
ع: اَبیَض، اَلهَق، مُلَهَّق.

**چەرمەڵە**
ك: چـەرمـگ.[سـپیکەڵە («ڵـە» نیـشانەی بـچووك کردنەوەیە.)]
ف: سـفید، سـفیدک، سـپیدک. («لـه» علامـت تصغیر است.)
ع: اَبیَض، بُیَیضَه.

**چەرمێڵە←چەرمەڵە**

**چەرمێنە**
ك: چەرمگی.[شپێنە (وەك: چەرمێنەی هێلکە.)]
ف: سفیدی، سفید. (تخم‌مرغ مثلاً.)
ع: قِیَقِیَ، آح، غِرقِئ، مُستَمیت، مُستَمیث، بَیاض، بَیاضُ البَیض، زُلالُ البیض.

**چەرمێنە**
ك: کێرەچەرمێنە.[ئەنـدامی نێرینـەی دەسـکرد (کـە لـە چەرم دروستی دەکەن.)]
ف: چرمینه، چَرمه، سَعتَر، کیـرکاشـی. (کـه از

چرم می‌سازند.)

ع: الفِینَة.

**چەرمێنەی‌چاو←چەرمگی چاو**

**چەرەن**

ک: هەڵیت. (چەرەن و پەرەن) [وڕاوە، قسەی پڕوپووچ.]

ف: چَرَند، پَرَند، یاوە.

ع: شَذَر، هَذَر، هُذاء، هَذي، خُرافَة.

**چەریك**

[(ك: لەشکری خێڵات، یا سوپای مەشق پێنەکراو کە تەنیا بۆ خواردن دێن.)]

ف: چَریک. (اردوی عشایری یا لشکر غیر نظام که فقط برای چریدن می‌آیند.)

ع: عَون، مَدَد، اِمداد، کُلفِي. مَرعِيّ.

**چەرین**

ك: لەوەڕین، دەمدان.[لەوەڕان: ئالفخواردنی ئاژەڵ.]

ف: چَریدن، چَراکردن.

ع: رَتع، رُتوع، رَعي.

**چەس؟**

[ك: چیە؟]

ف: چیست؟

ع: ماهو؟، مَهیَم؟

**چەسپ**

[ك: نووسەك]

ف: چسپ.

ع: لَزِج، لَزِب. لُزوجَة، لُزُوبَة.

**چەسپ**

[ك: لکێنەر. وەك: سرێش و کەتیرە (هەویرێك کە شتی پێ دەلکێنن.)]

ف: چسپ، کَبد، کَبدا، کَبید، بَیرزه. (خمیری که بدان چیزها چسپانند.)

ع: لَحیم، مَلغَمَة.

**چەسپان**

ك: کرژ، فرز، گورج، ئازا.[خێرا، چالاك]

ف: چست، فرز، چسپان، چابک، چالاک.

ع: سَریع، جَلد، وَحِيّ، فارِه، جَلید.

**چەسپان**

ك: زوو، گورج، ئازا، پەلە.[خێرایی]

ف: زود، فرز، شتاب.

ع: سُرعَة، عَجَلَة، فَوراً، سَریعاً.

**چەسپانن**

ك: لکانن.[نووساندن]

ف: چسپاندن، چسپانیدن، شبلانیدن، بشلانیدن، دوسانیدن.

ع: اِلصاق، اِلزاق.

**چەسپنە**

[ك: نووسەك]

ف: چسپنده، چسفنده، چفسنده، شبلنده، بشلنده، دوسنده.

ع: لَزِق، لَزِب، لَزِج، لازِق، لازِب، لاصِق.

**چەسپنەگی**

ك: لکیان.[نووسان]

ف: چسپندگی، چفسندگی، شبلندگی، بشلندگی، دوسندگی.

ع: لُزوقَة، لُزوجَة، لُزوبَة، لُصوقَة.

**چەسپیان**

ك: لکیان.[نووسان]

ف: چسپیدن، چپسیدن، چسفیدن، چفسیدن، شبلیدن، بشلیدن، دوسیدن.

ع: لُصُوق، لُزُوق، لُزُوب، اِلتِصاق، اِلتِزاق، اِلتِزاب، تَعَلُّق.

**چەشانن**

ك: مەزانن.[پێچەشتن، چەشاندن]

ف: چشاندن، چَشانیدن.

ع: اذاقَة، اِطعام، تَلمِيظ.

**چەشایی←زایقە**

**چەشت←چەشەخوەرە**

**چەشتن**

ك: چەشین، چەشەکردن، مەزین، مەزەکردن.[تام کردن]

ف: چَشیدن، مَزیدن، مَزه کردن.

ع: ذَوق، مَزر، لَسم، قَطم، لَمظ، زَلح، طَعم. تَذَوُّق، تَمَزُّز، تَلَسُّم، تَقَطُّم، تَلَمُّظ، تَزَلُّح، تَطَعُّم، اِستِطعام. ذائِقَة.

**چەشکە**

ك: چەشە، مەزە، مێلاك.[چێژە]

ف: چَشه، مَزه.

ع: ذَوق، مَزر، لَمظ، لَسم، زَلح، قَطم، طَعم.

**چەشمە**

ك: چاوکە، سەرچاوکە.[سەرچاوە، کانی]

ف: چشمه، زهـه، زه، زهاب، سرچشمه.

ع: عَین، یَنبوع.

**چەشمە**

ك: ئاورێز، ئاودەس، کەناراو، نیشتنگا.(خەلا)[پیشاو]

ف: آبریز، آبدست، جایی، کنارآب.

ع: مَبال، مَبرَز، مَخرَج، مَذهَب، مَخرَئَة، مُستَراح، بَیتُ الخَلا.

**چەشمەنلز**

ك: بەرچەرەن. (بەرچاوان)[دیمەن]

ف: چشم‌انداز، دیده‌گاه.

ع: مَنظَر، مَنظَرَة.

**چەشن**

ك: جۆر، تەحر، نەواخت، ئاکار.[شێواز]

ف: جـور، نـورَد، مانـنـد. پـام، فـام، همرنـگ، همنواخت.

ع: شِبه، شَبیه، مِثل، مَثیل، طِبق، وِفق، شَکل، طَرح، ضَرب.

**چەشنی**

ك: تەرقە، تەریقە.[ترەقە]

ف: چاشنی، تَرقَّه.

ع: صاروخَة، طَرَقَّة.

**چەشنی**

ك: مەزە، تام.[چێژ]

ف: چاشنی، مزه، خوَر.

ع: طَعم، لَذَّة.

**چەشنی**

ك: مەزە.[(ئەو ترشیەی دەیکەنە ناو چێشت.)]

ف: چاشنی. (ترشی توی آش)

ع: حُمُوضَة.

**چەشە**

ك: مـەزە، مـێلاك، چەشـکە.[چـێژە (چەشـتن بـۆ تاقی‌کردنەوەی تام.)]

ف: چَشه، مَزه. چَشش. (چشیدن چیزی بـرای امتحان)

ع: ذَوق، تَذَوُّق.

**چەشە**

[ك: چەشتە (ئەو چێژەی کە بۆ نێچیری دادەنێن.)]

ف: چَشته، گُزَک. (طعمه‌ای که بـرای جـانوران می‌اندازند.)

ع: طُعمَة، طُعم، مُذَقَة.

**چەشەخوەرە**

ك: چەشت.[(نێچیری چەشتەخواردوو.)]

ف: چَشت، چَشته‌خوَره، گُزَک‌خوَره. (جـانوری که چشته خورده باشد.)

ع: مُمَذَّق.

**چەشەخوەرەکردن**

ك: چەشت‌کردن.[(فێرەراو کردنی تانجی یا باز ـ بۆ نموونە ـ بە هۆی گیانداری بچووك یا بالندەی مالیەوە.)]

ف: چشته‌خوره‌کردن. (شکار یاد دادن به تازی یا باز مثلاً به وسیله‌ی جانور دستی یا مرغ خانگی.)

ع: اِضراء، تَضرِيَة، تَكليب.

**چەفت**

ك: گێر، لار، چەفتیاگ.[خوار، چەوت]

ف: چَفت، جَفت، چَفته، چَفده، جَفته، چَم، چَمیده، کج، کجیده، خم، خمیده.

ع: مُعوَجّ، مُعَوَّج، مُتَعَوِّج، مُنحَني.

**چەفتە**

ك: دالوورت.[داربەست]

ف: چَفت، چَفته، بَرَم، داربَست، چوب‌بندی، موبندی.

ع: مَسموك، مِسماك، مَشحَط، عَرِيشَة، دالِيَة.

**چەفتە**

ك: دروژ، بوختان.[دەلەسە، هەڵبەستە]

ف: چَفته.

ع: بُهتان، لُهمَة.

**چەفتەکەڵ**

ك: چوارساڵە.[چەفتەکەڵ (گای چوار ساڵە کە کەڵبەکانی داچوورێت.)]

ف: چهارساله. (گاو چهار ساله که دندان انیابش پست شده باشد.)

ع: يَفَن، رَباع، رَباعِيّ.

**چەفتەوراسە**

ك: قولاب، چەنگەك.[قولاپ]

ف: چَنگَک.

ع: كُلّاب.

وێنە←چەنگەك

**چەفتەوشیرە**

ك: سەرنجە، تواشا، وردەوبوون.[تێڕامان]

ف: نگاه، وارسی، تماشا. نگریستن، باریک‌بینی.

ع: دِقّة، بَغو، مُلاحَظَة، نَظّارَة، مُلاوَصَة، رُنُوّ.

**چەفتیاگ**

ك: گێرياگ، لار.[چەماوە]

ف: چَفتیده، جَفتیده، چَمیده، خَمیده، کَجیده.

ع: مَعوَّج.

**چەق**

[ك: دەمار (رەگی سپی.)]

ف: پَی. (رگ سفید)

ع: عَصَب.

**چەق**

ك: بن، بێخ. (چەق درگا مەسەلەن.)[بنك. پاڵ]

ف: پَی، بُن، بیخ. دَم، لا. (دم‌در، لای‌در مثلاً.)

ع: عِراق.

**چەق**

ك: چەقەسوور، سەخت.[(مرۆڤی سەرسەخت لە مامەڵەدا.)]

ف: سخت، چانه زدن. (سخت معامله)

ع: ذِرب، عَسوق، هَذّار، نَقّاف.

**چەقاڵە**

[(ك: میوەی نەگەیشتوو، وەك: قەیسی و قۆخ.)]

ف: چَقاله، چَغاله، جَغاله، اَخکوک. (میوه‌ی نارسیده از قبیل: زردآلو، شفتالو.)

ع: فَجاجَة، فِجّ.

**چەقاڵ←کونەجنئە**

**چەقاڵتە**

[(ك: پیری پەککەوتە.)]

ف: کلته. (پیر فرتوت)

ع: جَحمَرِش، حَيزَبون.

**چەقانن**

[ك: تێڕا کردن، پیا کردن]

ف: شَخاندن، شَخانیدن، شخاییدن، خلاندن،

خلانیدن، آژدَن، سپوختن، فروکردن.

ع: غَرز، رَزّ، نَخز، وَخز، اَبر، اِنشاب.

**چەقانە**

[ك: چەقەنە: ئەو دوو كانزا زەردە بچووكەی كە سەماكەر لە پەنجەی دەكا و دەیانتەقێنێت.]

ف: چِغانە، تال.

ع: صَحنان، صَفّاقَتان، وَنّ، صَنجان.

وێنە

**چەقانەژەن**

ك: ... پلتەقێن.[چەقەنە لێدەر، سەماكەر]

ف: یافَر، دست‌افشان.

ع: صَفّاق، رَقّاص.

**چەقچەقە**

[ك: چەقەنەی ئاش.] (چەقچەقەی ئاسیاو)

ف: لکلکە، لک‌لک، کَلَندە.

ع: ناعور، جُعجُعَة.

وێنە←دۆلیان

**چەقچەقە**

ك: كاسنی.[گیایەكە (گوڵێكی شینی هەیە.)]

ف: كاسنی. (گل كبودی دارد.)

ع: هَندَباء.

**چەقۆ**

ك: بەنیر.[كارد]

ف: چاقو.

ع: سِكّین.

وێنە

**چەقەچەق**

ك: چەقەسووبی.[چەنەبازی، سەرسەخت بوون لە مامەڵەدا.]

ف: چانەزدن، چونەزدن.

ع: تَشاحّ، تَراوُض، تَماكُس، ذَرابَة، عَسَق.

**چەقەسوو**← **چەق** (سەخت)

**چەقەڵ**

ك: رەقەڵ، لەر.[لاواز، كەم گۆشت.]

ف: لاغر.

ع: ضَعیف، نَحیف.

**چەقەڵ**

[ك: تۆرك: گیاندارێكە (تورك پێی دەڵێن: «چەقال».)]

ف: شُغال، شَغار، شَگال، شُگار، گال، تورە، اَهمَر.

(ترک «چقال» می‌گویند.)

ع: وَعّ، ابن آوي. (بِنت آوي)

وێنە

**چەقەڵ**

ك: پاچكە، هەنگڵ. (چوارچەقەڵ.)[پێچكە، پایە]

ف: پاچە. (چهارپاچە.)

ع: قَوائِم.

**چەقەن**

ك: سەخت.[رەقەن]

ف: سنگلاخ.

ع: حَرَّة، لُوب، حَجیر.

**چەقیان**

ك: چوون.[چەقین، تێڕاچوون]

ف: خَلش، شخا، شخیدن، خَلیدن.

ع: اِغتِراز، اِرتِزاز، نَشَب، نُشُوب، اِنتِشاب، تَنَشُّب.

**چەقین**

ك: چوون.[ڕۆچوون (چەقینە ناو قوڕ.)]

ف: فرورفتن. (به گل فرورفتن)

ع: سَوخ، ثُوخ، غَوص، خَوض.

**چەقین**← **چەقیان**

**چەك**

ك: زیلە، شەقەزیلە، شەپاڵە، شەپلاخە.[زللە]

ف: سیلی، تَپانچە، تَوانچە.

ع: لَطمَة، رَطسَة، طَبانجَة.

**چەك**

ك: ... داروبەرد.[ئامرازی شەڕ.]

ف: گدر، گَدرَک، اَوزار. (اَوزار جنگ)

ع: سِلاح، اَسلِحَة، مُؤنِسات، آلَة. (آلاتُ الحَرب.)

**چەك**

ك: رووت، قووت، رووتەڵ، قووتەڵ، قووتـە، چـەكە. شـڕ. [بێپۆشاك. شرۆڵ (كەسێك كە جلوبەرگەكەی دڕاوە.)]

ف: لُخت، لوت، برهنه. (كسی كه لباسش پـاره باشد.)

ع: عارٍ، عُريان.

**چەك**

ك: شڕ، داڕزیاگ.[شڕه (جلوبەرگی دڕاو.)]

ف: لَتره، شر، پاره، كهنه. (لباسی كه پاره شـده باشد.)

ع: بالي، عَتيـق، رَديـم، رَثّ، خَلَـق، واهـي، خِبس، سَمِل، هِدمِل، هِمء، هِرث، مُتقطِّع، مُتَلاشي.

**چەك**

ك: مشته ، كوتك.[ئامرازێكی هـەلاجی كردنـە (مـشتەی هەلاجی.)]

ف: چَک، مُشته، فَلخَم، فَلخَمه، فَخلَـم، فَخلَمـه. (چک حلاجی)

ع: مِندَف، مِنبَض، مِدَقّ، كِربال، مِطرَقَة.

**چەك**

ك: بەرات، نووسته.[كاغەزی حەواڵەی پارە.]

ف: چک، نوشته، رسید.

ع: صَكّ، قَبض، بَراة.

**چەك**

ك: پاژنە. (چەك و لووت.)[پاژنو (پاژنەی كلاش.)]

ف: پاشنه. (پاشنه‌ی گیوه)

ع: عَقِب.

**چەكانن**

ك: مژین، چلپانن.[مژتن (مەمكە مژینی منداڵ.)]

ف: چُكیدن، مَكیدن. (پستان مكیدن بچه)

ع: مَصّ، مَزّ، مَكّ، رَغث، رَضـع، عَـرم، امتِـصاص، ارتِغاث، ارتِصاع، اعتِرام، تَعالُل.

**چەكچن**

[ك: چەك كردن]

ف: چَک‌چین.

ع: خَلعُ السِّلاح.

**چەكمە**

[ك: جزمە]

ف: چَكمه.

ع: سِماة، جَزمَة. (طُماقات)

وێنە

**چەكوپووش**

ك: شڕوپڕە.[(وردەوپردەی ماڵ.)]

ف: لَک‌وپَک. (اسباب خانه)

ع: مُزجاة، بِضاعَة.

**چەكوش**

[ك: چەكوچ]

ف: چَكُـش، چَكـوچ، چـاكوچ، گَزینـه، كـوبَن، كوبین، خایسک.

ع: مِطرَقَـة، مِطـراق، مِلطـاس، مِـدَقّ، مِقمَعَـة، شاكوش.

وێنە

**چەكوش مسگەری**

ك: گەزینە.[(چەكوچی مزگەری.)]

ف: گزینه. (چكش مسگری.)

ع: مِلطاس.

وێنە

**چەك و كەوان**

ك: مشتـە و كـەوان، كوتـك و كـەوان.[ئـامرازی هـەلاجی كردن.]

ف: چَک و كَمان، مشته و كمان.

ع: مِندَف، مِندَفان. (اَلمِنبَض وَ الكِربال)

وێنەی هەیە.

**چەك و لووت**
ك: پاژنە و نووك. (گیوە)[ئەمسەر و ئەوسەر(ی کڵاش.]
ف: پاشنە و نُک.
ع: اَلْعَقِب وَ الرَّاس.

**چەکە**
ك: تووتە، رووت، قووت، شرە.[بێپۆشاك. شڕۆڵ]
ف: لخت، برهنە. پارە، شرە.
ع: عُریان. بالي، خَلَق.

**چەکە**
ك: روە.[دیوی بەرچاوی جلوبەرگ و لێفە و... (بە هەڵە بە مانای «روە» بە کار دەهێنرێت، دەنا لە بنەڕەتدا بۆ «ئاستەر» دانراوە.)]
ف: روە، ابرە. (بە غلط بر «روە» اطلاق می‌شود والا وضع آن برای آستر است.) آستَر، خلَّە.
ع: ظِهارَة، بِطانَة، خِلَّة.

**چەکەرە**
ك: چرووزە.[چەقەرە(ی دانەوێڵە و سەلکەکان.)]
ف: نیش، تُنزە. (حبوبات، پیازها)
ع: شَطا، وَشم، بارِض، نَتَش.

**چەکەرەشکێن**
ك: هەڵەرگەڕاندن.[هەڵگێڕانەوەی تۆوی کوولەکە یا گەرچك لە کاتی چەکەرەکردندا بۆ بەهێزبوونی.)]
ف: برگرداندن. (برگرداندن تخم کدو یا گرچک هنگام نیش‌زدن آن کە قوە پیدا کند.)
ع: نَتش، تَقلیبُ الْبارِض.

**چەکەرەکێشان**
ك: چرووزەکێشان.[چەقەرە کردن]
ف: تُنزەکشیدن، نیش‌زدن.
ع: بُرُوض، اِنشِطاء، اِنفِلاق، ظُهُورُ الشَّطا.

**چەکەوڕ**
ك: بۆگەن.[بۆنی ناخۆش (بۆنی ئێسقان ـ بۆکرووز ـ یا چەوری لە کاتی سووتاندا.)]
ف: بوگند. (بوی استخوان یا چربی کە بسوزند.)
ع:...

**چەل**
ك: دەس، نۆگە، چەلە، نۆرە.[نۆبە (سەرەی یاری کردن.)]
ف: دست. (نوبت بازی.)
ع: نَوبَة، لُعبَة.

**چەلە**
ك: چەل، نۆگە، نۆرە، دەس.[نۆبە (سەرەی یاری.)]
ف: دست. (نوبت بازی)
ع: نَوبَة، لُعبَة.

**چەلیپا**
ك: چەپوڕاس.[خاچ]
ف: چلیپا، چپوراست.
ع: صَلیبيّ، صَلیب.
وێنە

**چەڵتووك**
ك: تۆکل، پۆس. (گەنم مەسەلەن.)[توێکڵ، پێست (وەك: پێستی گەنم.)]
ف: پوست گندم. (مثلاً.)
ع: خِباء.

**چەڵتووك**
ك: تۆکلبرنج، پۆس‌برنج.[توێکڵی برنج.]
ف: پوست برنج.
ع: حُسالَة، حُثالَة، (سَلَبُ الاُرُزّ)

**چەڵتووك**
[(ك: برنج بە توێکڵەکەیەوە.)]
ف: شَلتوک، شالی. (برنجی کە از پوست برنیامدە باشد.)
ع: رُزّ، اَرُزّ، سَلَب. (سَلَبُ الْاُرُزّ)

**چەڵتووکجاڕ**
ك: شاڵیگا.[مەرەزە]

ف: کالجـا، گُرنجـار، شـالی‌زار، شـالی‌پایـه، شلتوک‌زار، برنج‌زار.

ع: مَرَزَّة.

**چەڵتە**

[ك: فیتنەیی](چەڵتە وەشاندن.)

ف: چُغلی.

ع: تَفتین، اِفساد.

**چەڵەحان**

[ك: چەلەحانێ (کاتێك سەرەی یاری کردنـی کەسێك بـە زۆر دەبەنەوە هەندێ وشەی ناشیرینی سەروادار دەڵێت هەتا سەرەکەی پێ بدەنەوە.)]

ف: دست‌خواهی. (هنگامی کـه دسـت کـسی را بـه زور ببرند پاره‌ای کلمات رکیک مُقفّا را گوید که دستش را بدهند.)

**چەڵەم**

ك: چەڵەمە، کەڵەم، کەڵەمە، چەمەر، چەمەرە.[کەڵـەوە (وەك: کەڵەمەی گەردنی گا.)]

ف: چَنبَر، چَنبَره، پَرگار. (چنبـره‌ی گـردن گـاو مثلاً.)

ع: طَوق، دائِرَة.

وێنە

**چەڵەمە**

[ك: چوڵەمە: ئێسقانی نێوانی شان و مل.]

ف: چَنبَره، چَنبره، جَناغ، آخُر، آخور، آخورَک.

ع: تَرقُوَّة، تریبَة.

وێنە

**چەڵەمە←چەڵەم**

**چەڵەمەشکانێ**

[ك: چەڵەمەشکێنە: جۆرە گرەوێکە.]

ف: جَناغ‌بازی، جَناغ‌شکستن.

ع: لَعبُ التَریبَة، کَسرُ التَریبَة. (مُتارَبَة)

**چەڵەمەی کورێس**

ك: چاکڵە.[ئەڵقەی دارینی سەری قەیاسە.]

ف: تیلا، وهَنگ.

ع: فَریس، زَاجَل.

وێنەی هەیە.

**چەم**

ك: چوخور، ڕۆخانە.[ڕووبار]

ف: رود، زوغ، رودخانه.

ع: نَهر، وادِي.

**چەم**

ك: مانا.[چەمك]

ف: چم، آرش.

ع: مَعني، مَفاد، مِصداق.

**چەم**

ك: خەم.[چەماوە. چەمینەوە]

ف: چَم، خَم. چَمیدگی، خَمیدگی.

ع: اِنعِطـاف، اِعوِجـاج، اِنحِنـاء، تَعَقُّـف، مَـیَلان. مُنعَطِـف، مُعَوَّج، عَوج، مُـنحَني، مُتَمایِل، مُتَعَقِّف. عَوَج.

**چەم**

ك: چاو، دیدە.[چاڤ، دیە]

ف: چَم، چَشم، چَش، دیده.

ع: عَین، بَصَر.

**چەم**

ك: خەم. کۆم. جەنگ، چەمیاگ.[لار، چەماوە]

ف: کال، چَنگ، چَمچاخ. چَمیده، خَمیده.

ع: مُـنحَني، مُنعَطِـف، مُتَعَقِّـف، مُتَعَـوِّج، مُلتَـوِي، مُتَمائِل.

**چەمانن**

ك: نووچانن، خەم‌کردن.[خوار کردنەوە، چەماندنەوە]

ف: چَماندن، خَماندن، کَج‌کردن، خَم‌کردن.

ع: عَطف، حَنو، حَجن، قَنح، عَقش، تَحنِیَة.

**چەمانەوە←چەمانن**

**چەمك**

ك: قەرخە ، قەراخ، کەنار.[لێوار]

ف: کنار، کران.

ع: حاشِيَة، حافَة، حَرف، طَرَف، سِيف.

**چەمك**

ك: گوزارە ، مانا.[واتا]

ف: چَم، آرش، گُزارە.

ع: مَعني، مَدلول، فَحوى، فَحواء، مِعراض، مِصداق، مَغزى.

**چەموچوخوڕ**

ك: چەم، رۆخانە.[رووبار]

ف: رودخانە.

ع: وادِي، نَهر.

**چەموخەم**

ك: ناز، چەم.[لەنجەولار]

ف: چَم، چام، خَرام، ناز، چَم‌وخَم، خَم‌وچَم. (چمیدن و خمیدن.)

ع: دِلال، تَدَلُّل.

**چەمۆلە←پووك (پووكاوك)** [(وشەیەكی كرماجییە.)] (کرماجی است.)

**چەمووش**

ك: چالاخ، ناراس.[لەقەهاوێژ و گازگر (ولاخێك كە مل نادات بۆ بار كردن یا سوار بوون.)]

ف: چموش، پُشت‌نَده. (الاغی‌كه برای بار یا سوار پشت ندهد.)

ع: شَموس.

**چەمە**

ك: كەمە.[چەماوەیی]

ف: چَمیدگی، خَمیدگی.

ع: عُقفَة.

وێنە←گۆچان

**چەمەدان**

[ك: باوەڵ: جێگەی جلوبەرگ تێنان.]

ف: چمەدان، چامەدان، جامەدان.

ع: عَيبَة، وَفضَة، حَقيبَة، سَنتَبَة.

وێنە

**چەمەر←چەلەم**

**چەمەرە**

ك: دايرە، دائيرە، ئەلْقە، ناخلە.[كەمە، گەر]

ف: چَنبَرە، بَرهون، دولە.

ع: دائِرَة، دارَة، دَهمَة، اِطار.

**چەمەرەخیار←ترۆزی**

**چەمەری**

[(ك: دەهۆڵ لێدان بۆ لاواندنەوەی مردوو.)]

ف: چمری. (دهُل عزا)

ع: كُوسُ العَزاء.

**چەمەن**

ك: چیمەن.[مێرگ]

ف: چَمَن، سبزەزار.

ع: مَرج، مَخضَرَة.

**چەمەنتۆ**

[ك: چیمەنتۆ، سیمان]

ف: سمنت.

ع: لاقوتَة. (جِصّ، جَصّ)

**چەمیلك**

ك: چەم، خەم، گێڕ، نووچیاگ. قاخ.[چەماوە، خوار]

ف: كال، چنگ، چَمیدە، خَمیدە، چَمچاخ.

ع: مُنحَنِي، مُنعَطِف، مُلتَوي، مُتعَقِّف، مُعَوَّج، اَلوى، اَعقَف، اَعوَج.

**چەمیانەوە**

ك: نووچیانەوە، گێرییان، كۆمەربوون.[داهاتنەوە، نوشتانەوە]

ف: چَمیدگی، خَمیدگی، كالیدگی، خمیدن، چمیدن، كالیدن، چنگ شدن.

ع: اِنحِنـاء، اِنعِطـاف، اِلتِـوی، اِنـصبیار، اِنعِـواء، اِنعِقـاف، اِنثِنـاء، اِنعطـاط، اِعوجـاج، اِرتِجـاج، اِنقِعاض، تَعَطُّف، تَعَقُّف، تَعَوُّج، تَغَوَّج، تَثَنّي، عُهنَة، تَمایُل، سَیَلان.

**چەن**

ك: ... ئەن.[چەند؟، هەندێك]

ف: چَند؟، چَندە؟، چَنـدَک؟. اَنـد، اَنـدە، اَنـدَک، ایدَند.

ع: کم؟. بِضع، نَیف،نَیِّف.

**چەناخ←چناکە**

**چەنان**

ك: ئەونە.[ئەوەندە، هێندە]

ف: چندان.

ع: بِمِقدار.

**چەنان کردن**

ك: ئەونە کردن. [هێندە کردن، ئەوەندە کردن]

ف: چندان کردن.

ع: ضَرب.

**چەنجار**

ك: چەنبار.[چەند کەڕەت]

ف: چندبار، چندین‌بار.

ع: کَم، مَرّاتٍ، مُکَرَّراً.

**چەنگ**

ك: گێر، چەم، خەم، چەمیاگ.[لار، چەماو]

ف: کال، چنگ، چمیده، خمیده، چَمچاخ.

ع: مُنحَنی، مُنعَطِف، مُلتَوي، اَعقَف، اَعوَج.

**چەنگ**

ك: زنج.[ئامێرێکی مۆسیقایە.]

ف: چَنگ، چَلَپ، سنج، سرنج، اَسرنج.

ع: صَنج، سَنج.

وێنە←زنج

**چەنگەك**

ك: چفتە، قولاب، چفتە و راسە.[قولاپ]

ف: چَنگ، چَنگک، کَژ، کَژنـه، کَلاژکـه، کَلاشَـکه، چاەجو، چاەپوز، دَروَند، قُلّاب.

ع: عَدَقَة، عَودَقَة، مِعلاق، کُلّاب، کلُوب. عُقّافَه.

وێنە

**چەنێ**

ك: چەن رۆژێ.[ماوەیەك]

ف: چندروزی، چندگاهی، چندی.

ع: مُدَّةً، بُرهَةً، حیناً.

**چەنە**

ك: چناكە.[چەناكە]

ف: چَک، چانه، کَچه، کاچـه، چَنـه، مَنـه، زُنـج، زَنَخ، زفر، آرواره.

ع: فَكّ، فَقم، لَحي، ذَقَن، فُقم، حَنَك.

**چەنەبەچەنە**

[ك: شەڕەقسە، دەمەدەمێ]

ف: چانه‌به‌چانه.

ع: مُعارَضَة، مُنازَعَة.

**چەنە دان←چناكە دان**

**چەنەوەر**

ك: دەمەوەر، چناكەشكیاگ.[زۆر بلێ، هەڵەوەڕ]

ف: پُرچَنه، پُرچانه، چَنه‌وَر، چانه‌زَن، مُفت‌گو.

ع: ذِرب، هَذّار، بَذِي، بقباق، ذَرذار، مِهذار.

**چەنەوەری**

ك: چناكە دان، دەمەوەری.[هەڵەوەڕی، فرەوڕێسی]

ف: پُرچَنَگی، پُرچانَگی، چانـه‌زَنـی، چَنـه‌وَری، مُفت‌گویی.

ع: هَذَر، ذَرَب، ذَرابَة، بَذائَة.

**چەنی**

ك: گـەر، تـەك، لە گـەر، لەتـەك.[لە گـەڵ (وشـەیەكی گۆرانیيە.)]

ف: با، اَبا. (گورانی است.)

ع: مَعَ.

**چەنی؟**

ك: بۆچە؟ [بۆچی؟ (وشەیەکی گۆرانیە.)]

ف: برای‌چه؟، چرا؟ (گورانی است.)

ع: لِمَ؟

**چەنیَ**

[ك: چەندە؟، هێندێك]

ف: چندی، چند؟

ع: كَم؟، كَمّ؟، كَمّاً، بِضعاً، نَيفاً، مِقداراً.

**چەواشە←چەپەوانە**

**چەودان**

ك: دەنكە.[چاردار (گیایەکە لە گەنم دەچێت و لە ناو پەڵە گەنمدا دەڕوێت.)]

ف: چَـودان. (علفـی اسـت شـبیه بـه گنـدم در گندمزار سبز می‌شود.)

ع: دَنقَة، زُؤان، زُوان، دَوسَر، شَلِيم، سِنف.

وێنە

**چەودەن**

ك: مەفرەق.[کانزایەکە.]

ف: چُدَن، آهـن خام.

ع: مَفرَغ.

**چەور**

ك: رۆناوی.[رۆن تێوەچوو]

ف: چَرب، سُغبه، روغـن‌آگین.

ع: دَسِم، مَدهون.

**چەور**

ك: بالاّ. بالاّتر، فرەتر، سەنگینتر.[زۆر. لەسەرتر، قورستر]

ف: بیش، بسیار. بیشتر، سنگینتر.

ع: كَثير. اَزيَد، اَثقَل.

**چەوربوون**

ك: پیەو تلیان.[تێوەتلان (ئیدیۆمە.)]

ف: چرب شـدن، آلـودەشـدن، ترشـدن. (کنایـه است.)

ع: تَلَطُّخ.

**چەوروچلیك**

ك: چەور، چلووك، چرووك.[چلکنی رۆناوی]

ف: چَرب، چرکین.

ع: مَدهون، قَذِر، كَثِيف.

**چەوروشیرینی**

[ك: مەرایی (ئیدیۆمە.)]

ف: چرب و شیرینی. (کنایه است.)

ع: مُداهَنَة، مُلايَمَة.

**چەوروشیرینی**

[ك: مووڕووی خۆشەویستکەر.]

ف: مهرەی دوستی.

ع: صُدحَة.

**چەورونەرم**

ك: زوانباز.[زمانلووس، ماستارکەر]

ف: چربونرم، چرب‌زبان، زبان‌باز.

ع: مُداهِن، مُزَوِّر، مُتَمَلِّق.

**چەوری**

[ك: چەورایی]

ف: چَربی، چَربو، چَربش.

ع: وَدَك، اِهالَة، صُهارَة، دُسومَة.

**چەوریدان**

ك: رۆتدان، جێگەرۆن.[دەفری چەوری.]

ف: روغندان، جای‌روغـن.

ع: مَدهَنَة.

وێنە

**چەوری‌ونەرمە**

ك: گۆشت و دووگ.[گۆشتی زۆر چەور]

ف: شهله، گوشت و دُنبه.

ع: لَحم وَ شَحم.

**چەهچەهە**

ك: دەنگ بولبول.[ئاوازی بولبول.]

ف: چەچَه، چَهچَهَـه، غُلغُـل، آواز بُلبُـل، نـوای بُلبُل.

ع: غَرِد. (صَوتُ العَندَليب)

**چی**

ك: گەر، وان. (دروساخچی، مسگەر، دروساخوان)[پاشگرە بە مانای چاودێر یا خاوەن پیشە بوون.]

ف: چی، گر، بان.

ع: ...

**چی**

ك: چت. [شت (سوکەڵەی «هەرچتێ»یە.)]

ف: چی، چیز. (مخفف «هەرچتێ»)

ع: شَيء.

**چی؟**

ك: چە؟. [چ شتێك؟ (وشەیەکی کرماجیە.)]

ف: چە؟، زش؟. (کرماجی است.)

ع: ما؟

**چی؟←بۆچە؟** [(وشەیەکی هەورامیە.)] (اورامی است.)

**چیا←کێف**

**چیامانی**

ك: ئارمردار. (مەردەئارق)[ئارەقی ساروی لەش بە هـۆی لاوازیەوە.)]

ف: سَـردخَو، مُـردەخَـو. (عـرق سـردی کـه از ضعف می‌آید.)

ع: ...

**چیت**

ك: پارچە.[قوماش]

ف: چیت، پارچە، قماش.

ع: نَسيج، مُنَقَّش، شيت.

**چیچلەمەچان**

[ك: یاریەکـە کـە منـداڵان و کـچان بـە چیـچکانەوە هەڵدەپەڕن و چەپڵە لێدەدەن و هەندێ شت دەڵێن.)]

ف: آرغُـشتَک. (بـازی‌ای اسـت کـه بچـه‌هـا و دخترها چُنباتمە می‌رقصند و کف مـی‌زننـد و چیزها می‌گویند.)

ع: رَقصُ القُرفُصی.

**چیچەت**

ك: دەریاچەی ورمێ.[ناوی گۆلێکە لە نزیك شاری ورمێ.]

ف: دریاچەی ارومیە.

ع: بُحَيرَةُ اُورمِيَّة.

**چیچی**

ك: جنچکان.[چیچکان]

ف: چنباتمە.

ع: قُرفُصاء، قُرفُصی.

وێنە←جنچکان

**چیخ**

[ك: پەردەی لە قامیش دروستکراو.]

ف: چیغ، چِغ، آلاچیغ.

ع: حَظيرَه، حِظار، حِباك.

وێنە

**چێر**

ك: دڕس. (چێر و مێر) [هاوڕێ، خۆشەویست]

ف: دوست، رایگان.

ع: خِدن، حَبيب.

**چێر**

ك: شێر، شێرگیر.[ زاڵ]

ف: چیر، چیره.

ع: غالِب، مُستَولي. جَسُور.

**چیر**

ك: تێر.[(ڕوانین بە گۆشەی چاو بە هۆی تووڕەییەوە.)]

ف: آغول، آلوس. (به گوشەی چشم نگریستن از خشم.)

ع: شَزر، خَزر، خُزرة، غَيظ.

**چیر**

ك: ریچ. (چیڕەو کردن)[ددان دەرخستن لە تووڕەییدا.]

ف: غورچە، نُهور.

ع: کِشرَة، کُلُوح. کالِح.

**چیراتن**

ك: جیقاتن.[جوو کاندن (وەك: جیقاندنی کەو.)]

ف: جیق‌کشیدن. (کبک مثلاً.)

ع: زُقیَة.

**چێرومێر**

ك: دۆس.[خۆشەویست، هاوڕێ]

ف: دوست، مهربان، رایگان.

ع: خِدن، حَبیب. تَحابّ، تَوادّ.

**چێرە**

ك: دەموچاو.[روو، روخسار]

ف: چهره، چهر، رُخ، رُخسار، رو، روی، دیم.

ع: خَدّ، وَجه، صُورَة.

**چێرە**

ك: قەرەوی، قەرەبوو.[بژاردنەوە، هێنانەوەجێ]

ف: چهره، داشاد، داشَن، شیان.

ع: تَلافِي، تَدارُك، جُبران، جُبُور.

**چێرە**

ك: چێر، شێر، شێرگیر.[زاڵ]

ع: غالِب، مُستَولِي. غَلَبَة، اِستیلاء.

**چیرە**

ك: جیقە.[جووکە (جیقە کردنی کەو.)]

ف: جیق. (جیق کشیدن کبک.)

ع: زُقیَة.

**چیرەبوون**

ك: قەرەوی‌بوون.[قەرەبوو کردنەوە، هێنانەوەجێ]

ف: چهره‌شدن.

ع: تَدارُك، تَلافِي، جُبران.

**چیرەوکردن**

ك: ریچەو کردن.[ددان دەرخستن (وەك: دان چیڕ کردنەوە لە تووڕەییدا.)]

ف: نُهوریدن، غورچه‌کردن. (غورچه کردن دندان از خشم مثلاً.)

ع: کَشر، تَکَشُّر، کِشرَة، کُلُوح، کَلاح. خَزر، شَزر، شَوس. اِزراق.

**چێرەیی**

[ك: پەمەیی (رەنگی سووری کاڵ.)]

ف: فور، چهره‌ای، پشت‌گُلی. (رنگ سرخ کم رنگ.)

ع: شُربَة، وَردِيّ.

**چێشت**

[ك: خواردەمەنی لێنراو]

ف: وا، با، أبا، ابا، آش، شوربا.

ع: طِبخ، طَبیخ، مَرَق، حَساء.

**چێشتەخوەشە**

ك: تفاق.[داودەرمان ر دانەوێڵە کە دەکرێتە ناو چێشت.]

ف: أوزار، بُنشن.

ع: تابِل، تَوابِل، تَباریق، قِزح.

**چێشتەکولێن**

ك: پوخت.[پێداویستی چێشت لێنان کە بەشی یەك چێشت بکات.)]

ف: پُخت، بُختینه. (مقدار یک پخت لوازم آش.)

ع: طِبخ.

**چێشتەکولێن←تفاق**

**چیکلە**

ك: چوکلە.[چیلکە]

ف: نُسوک، دُروک، خَلاشه.

ع: سُجور، خُتَّة، وَقش، وَقص، زَغف.

**چیل**

ك: ڕەش‌بەڵەك.[ڕەشێك کە پەڵەی سپی تێدایە (ڕەشی خاڵاوی.)]

ف: سیاه و سفید. (سیاه خالدار.)

ع: اَبرَش.

وێنە←مرمرشتی

**چیلانگەر**

[(ك: قفلساز)]

ف: چیلانگر. (قفل‌ساز.)

ع: قَفّال.

**چیلکە←چیکلە**

**چیڵ**

ك: چەفت. (چەفت و چیڵ)[خوار (چەوت و چەوریڵ)]

ف: کـج، چفـت. خَـم، چَـم، کجیـده، خمیـده، چمیده، چَفته، چفتیده.

ع: مُعوَّج، مُتَعوِّج، مُنحَني.

**چیڵکڕ**

ك: پاداو.[بەق (کەوی ڕاو.)]

ف: خُروهـه، خَرخَشه، خَرخِشه، پـادام. (کبـک دام)

ع: مِلواح، رامِج.

**چیڵکڕ**

ك: کڕ کەفتن.[(کاتی لەسەر هێلکە خەوتنی مریشك بـۆ جوجەڵە هەڵهێنان.)]

ف: کرشدن. (هنگام خوابیدن مرغ بر تخـم کـه جوجه دربیارد.)

ع: رَخم، وَکن، حُبُوم، حُضنَة.

**چیلک**

ك: سـوخت.[ئەغینە، ئێزنگ]

ف: هیمه، هیزُم، سوخت.

ع: حَطَب، حَضَب، حَصَب، هَرمَی، اَجزَل.

**چیلکەوکردن**

[ك: لەت‌لەت کردنی دار بۆ سووتاندن.]

ف: هیزم شکستن.

ع: شَقّ، ذَح.

**چیم**

ك: مێرگ، چیمەن.[چەمەن، مێرگ (گیایەکی بەناو بانگە لە گەنم دەچێت. کە لە دەورووبەری جۆگە و شوێنی ئاوداردا سەوز دەبێت و «تەخت/زەوینـە»ی باخـچەی لـێ دروسـت دەکەن.)]

ف: چیم، چَمَن، مَرغ، فَریز، پَریز. (علفـی اسـت شبیه به گندم کـه در اطـراف جـوب و جاهـای آبدار به هم مـی‌رسـد و مـتن باغچـه‌هـا از آن می‌سازند.)

ع: مَرج، فَرِيز.

**چیمەن←چیم**

**چیمەنتو←چەمەنتو**

**چین**

ك: ڕزن، ڕەگ.[ڕیز، چینە (چینی دیوار.)]

ف: چینـه، رَده، لاد، نـسپه، نیـسپه. (نیـسپه‌ی دیوار)

ع: صَف، ساف، سافَة، عَرَق، مَرتَبَة.

**چین**

ك: چرچ، لۆچ.[لۆی بەسەر یەکدا هاتوو.]

ف: چین، ماز، آژَنگ، شکَن، شکَنج.

ع: خَبن، غَبن، غَضن، ثَني.

**چین پێشانی**

ك: دزژەنگ.[(لۆچگەلی تەوێڵ.)]

ف: اَژَنگ، آژَنگ. (کَشَک‌های پیشانی)

ع: سُرُر، سِرار، اَسارِیر.

**چین دەموچاو**

ك: لۆچ تەتڵە، لۆچ گوپ.[(چرچ و لۆچی دەموچاو بە هۆی پیریەوە.)]

ف: اَنجَخ، آژَنـگ، اَژَنـگ. (چـین رخـسار کـه از

